# نهێنیەکانی گەردوون لە نێوان قورئان و زانستدا

**ڕاستی زانستی نویێ لە ئیعجازی زانستی لە قورئان دا**

**چاپی یەکەم ١٤٢٩ ک -٢٠٠٨ ز**

**نوسینی / ئەندازیار عبد الدائم کحیل**

**وەرگێڕانی بۆ زمانی کوردی جەمال موحەمەد ئەمین**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

**وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِمَّنْ دَعَا إِلَى اللَّهِ وَعَمِلَ صَالِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ**

[فصلت: ٣٣]

## نووسەر لە چەند دێڕێکدا

نووسەری ئەم دانراوە ناوی ( عبدالدائم الكحيل ) کە پیشەی ئەندازیارە و تۆژەرەوەشە لە بواری ئیعجازی زانستی لە قورئان و سونەتدا ،لە ساڵی ١٩٦٥ لە شاری ( حمص ) ی سوریا لە دایك بوە ،خێزاندارە و دوو منداڵی هەیە و زمانی عەرەبی و ئینگلیزی بە باشی دەزانێت .



خاوەن بڕوانامەی بکالۆریۆسە لە ئەندازەی میکانیك ١٩٩٥ و ،بڕوانامەی دبلۆمی ئەندازەی شلەکان ساڵی ١٩٩٧ ،دبلۆمی پەروەردە ساڵی ٢٠٠٠ ئەمانەو چەندین تۆژینەوە و لێکۆڵینەوە لە ڕاڤەی قورئان و خوێندنەوە و زمانی عەرەبیدا هەیە .

خاوەنی زۆر چالاکی بیری و کۆڕ و سیمینارە لە بوارەکانی ئیعجازی زانستی و ژمارەیی لە قورئان و سونەتدا ،و چەندین دانراو و بابەت و ووتاری هەیە لەو بوارانەدا .ئەمەش سایتەکەیەتی لە سەر تۆڕی ئینتەرنێت :
www.kaheel7.com

سەرنج : ١ ) بەپێی پێویست و گرنگی بابەتەکان لە هەندێك شوێندا ڕاڤەی ئایەتەکان یان بەشێکیان و یان چەند ووشەیەکیانم کردوون .

٢ )لە کۆتایی دانراوەکە ناوی سەرچاوە عەرەبی و بیانیەکان ڕیزبەندکراون کە نووسەر سوودیان لێوەرگرتوە ،وەهەر خوێنەرێکی بەڕێز دەیەوێت دڵنیابێت لەو ووتارانە دەتوانێت لە سەر هەمان ئەو ناو و نیشانە ئەلکترۆنیانەی ئاماژەیان بۆ کراوە لە تۆڕەی ئینتەرنێتەوە ئەو بابەتانە ڕابکێشێت و بیانخوێنێتەوە کە بە زمانی ئینگلیزین .

( وەرگێڕ )
٢٠ شەعبان ١٤٢٨ ك
٢ ئەیلول ٢٠٠٧ ز

# پێشەکی

سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی ئا بەم نیعمەتە گەورەیەی قورئان ئێمەی بە سەر کردۆتەوە و کردویەتی بە ڕووناکیەك بۆ تاریکاییەکانی ژیانمان ،درود و سلاویش بۆ گیانی ئەو پەیامبەرە نەخوێندەوارەی کە خوڕەوشتی بریتی بوە لەو قورئانە و بۆتە پێشەوا و ڕووناکی ناو دڵەکەی و هەروەها لە بنەماڵەکەی و یار و یاوەرانی تا ڕۆژی دوایی .

جوانترین ساتەکانی کە بڕوادار تیایدا دەژی ئەوەیە کە لە ڕێگای زانستەوە بگات بە بڕوا بە خوا و گەورەیی کتێبەکەی کە موعجیزەیەکی نەمرە ، هەموو ئەو ڕاستیە زانستی و گەردوونیانەی کە لە قورئانی پیرۆزدا هەن بۆ ئەوەیە کە بڕوای بڕواداران زیاد بکات و هۆیەکیش بێت بۆ هەموو بێبڕوایەك کە لە ژێر ڕۆشناییەکەی بگاتە ئەوەی کە بڕوا بێنێت و ڕاستاندنی ئەو قورئانە و ئیسلام بسەلمێنێت .

لەم بابەتە زانستیەدا چەند کاتێك بەسەر دەبەین لەگەڵ چەند ئایەتێکی و موعجیزەی سەرسوڕمێنەر و چەندین ڕاستی زانستی کە ١٤ سەدە لە پێش ئێستادا قورئانی پیرۆز ئاماژەوی بۆ کردوون و زاناکانی سەدەی بیست و یەکیش ئێستا دێن و وەك خۆی دەیانڵێنەوە هەروەك چۆن هاتوون !! بە لامانەوە سەیر نەبێت کە زانایانی سەردەم هەمان گوزارشی قورئانی بەکار دێننەوە ،ئەمەش بە دڵنیاییەوە تەنها قسەی ڕووت و پێوەنراوەوە نیە بەڵکو ئەوە ڕاستیەکە بۆ هەموو ئەوانەی دەسەلمێنێت کە دەڵێن قورئان لە ڕووی زانستی و گەردوونیەوە موعجیزە نیە ،قورئان لەگەڵ ئەوەشدا کە کتێبی ڕێنومایی و یاسادانانە هەروەها کتێبی زانستەکانیشە و هەر زانایەك موعجیزەی زانستی وای تێدا دەبینێتەوە کە بگونجێت لەگەڵ پسپۆڕیە زانستیەکەی خۆیدا .

لەم زنجیرە تۆژینەوە زانستیە قورئانیەدا هەوڵدەدەین گەشتێکی ئیمانی بکەین لە ژێر سایەی ئایەتەکانی قورئاندا تا بزانین چۆن زانست ڕۆڵی ڕاستاندنی کتێبی خوا دەبینێت و لەگەڵیدا هاوئاهەنگە بەڵکو لەوە زیاتریش دەبینین کە هەمیشە قورئان بالادەستە بە سەر زانستدا چونکە ئەو قورئانە کتێبی خوا و موعجیزەی هەتاهەتاییە .لەم تۆژینەوەدا و لە میانەی ڕاستیە زانستیە گەردوونیەکاندا دەچینە نێو قولایی هەندێك لە ئایەتەکانی کە باس لە بینای ئاسمان دەکەن و هەموو گەردوونیش بینایەکی توند و تۆڵە و هیچ درز و کون وکەلەبەرێك و شێواویەکی تێدانیە .

زاناكان جەخت لە تێرووپڕی بونیادی گەردوونی دەکەنەوە و جەخت لە بینینیان بۆ چنراوی گەردوونی دەکەنەوە کە چۆن چنراوێکە بەو پەڕی وردکاری و داهێنانەوە و ئەستێرەکان و مەجەڕەکان هەروەکو دەنکە مرواری شانۆی گەردوونیان ڕازاندۆتەوە .

سەیر دەبێت لە لامان ئەگەر زانیمان قورئانی پیرۆز ئاماژەی بەو ڕاستیە زانستیانە داوە بەوپەڕی وردی و ڕوونی و کورتی و ئیعجازەوە ، خوای گەورە دەربارەی ئاسمان دەفەرموێت : (اللَّهُ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ قَرَارًا وَالسَّمَاءَ بِنَاءً وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَرَزَقَكُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ فَتَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ) ﴿غافر: ٦٤﴾.

لەو ئایەتەدا بە ئاشکرا دیارە کە ئاسمان سەقفە بۆ زەوی کە ئەوە لە بڕگەکانی داهاتووی ئەم کتێبەدا دەبینین .بەڵام دەربارەی چنراوی گەردوونی ئەوا قورئانی پیرۆز ئاماژەی بۆ دەکات و سوێند بە ئاسمان دەخوات : (وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْحُبُكِ) ﴿الذاريات: ٧﴾، کە زاناکان لەم دوادواییانەدا توانییان گەردوون ببینن لە سەر پێوەری زۆر گەورەکراو کە ئاسمان بە تەواوی وەك ڕستێکی چنراو دەردەکەوت ،جوانترین وەسف بۆ ئەو دیمەنانە ئەوەیە کە قورئان بەکاری هێناوە و زانستیش پشتڕاستی دەکاتەوە ،بێگەردی بۆ بەدیهێنەری گەورە !

هەر لەم دانراوەدا دەبینین کە قورئان باس لە دوکەڵی گەردوونی دەکات لە قۆناغێك لە قۆناغەکاندا ،زاناکانیش بە بەڵگەی دابڕکار و شیکاری تاقیگایی ئەوەیان سەلماندوە کە گەردیلەکانی تۆزی گەردوونی کە لە فەزای دەرەوە وەریانگرتوە باشترین وەسف یۆ ئەو گەردیلانە ووشەی ( دخان )ە واتە دوکەڵ .گەورەیی قورئان لەوەدا دەردەکەوێت کە زۆر لە پێش زاناکانەوە ئەو ووشەیەی بەکارهێناوە وەك دەفەرموێت : ( ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ائْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ) ﴿فصلت: ١١﴾ .

لە ئایەتەکەدا دوو ئیعجاز دەردەکەوێت : یەکەم ووتاری قورئان دەربارەی دوکەڵ لە قۆناغێك لە قۆناغەکانی پەرەسەندن و گۆڕانی گەردوونیدا کە تازە بە تازە زاناکان گەیشتوون بەوە ،دوەم ووتاری قورئان دەربارەی ئاسمان لەو قۆناغەدا کە زاناکان لەم دواییانەدا ئەوەیان دۆزیوەتەوە کە گەردوون لە سەرەتا سەرەتاکانیەوە پاش تەقینەوە مەزنەکە شەپۆلی دەنگی ناردوە !! .

بوونی ئەو ڕاستیە زانستیانە لە قورئاندا لە پێش ١٤ سەدە لەمەوبەرەوە کە تازە بە تازە لەم سەردەمانەدا دەدۆزرێنەوە بەڵگەی ماددین لەسەر ئەوەی کە ئەو قورئانە لە لایەن خوای بەدیهێنەرەوە دابەزیوە و کتێبێکە بۆ هەموو کات و شوێنێك دەگونجێت بە پێچەوانەی بۆچوونی ئەوانەی کە گومانیان لەو قورئانە هەیە و دەڵێن بۆ ئەم سەردەمە ناشێت بە بەڵگەی ئەوەی کە ئەو ئایەتانەی باس لە دیاردە گەردوونیەکان دەکەن لە ڕووی زانستیەوە ڕاست نین .

هەر بۆیە ئەم لێکۆڵینەوەی بەردەستت هەنگاوێکە بۆ ڕاستکردنەوەی ئەو تێڕوانینە و ئەو ڕاستیانەی کە دەیانبینین و پشت دەبەستن بە ووتەی زاناکان لە ئاژانسی فەزایی ئەمەریکی (ناسا ) کە ئەوەش باشترین بەڵگەیە لەسەر ئەو هاوڕازیەی لە نێوان ئەوەی زاناکان تازە پیێ ی دەگەن و ئەوەی سەدان ساڵ پێش ئێستا لە قورئانی پیرۆزدا هاتوە .

بەو هیوایەی کە ئەم زنجیرە زانستیە قورئانیانە ببێتە بیرخەرەوەیك بۆ مرۆڤی بڕوادار کە گەورەیی و ئیعجازی کتێبی خوای بۆ دەربکەوێت و لە هەمان کاتیشدا ببێتە هۆکارێك بۆ ڕێنومایکردنی بێبڕوا بەوەی کە ئەو قورئانە پیرۆزە لە لایەن خوای گەورەوە هاتوە .

( وَلِيَعْلَمَ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِنْ رَبِّكَ فَيُؤْمِنُوا بِهِ فَتُخْبِتَ لَهُ قُلُوبُهُمْ وَإِنَّ اللَّهَ لَهَادِ الَّذِينَ آَمَنُوا إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ) ﴿الحج: ٥٤﴾.

**ئەندازیار** عبد الدائم الكحيل

## سەرەتای چیرۆکەکە

جوانترین ساتەکان ئەوانەن کە مرۆڤی بڕوادار تیایاندا موعجیزەیەکی نویٚ لە کتێبی خوای گەورەدا دەدۆزێتەوە ، کاتێك کە بۆ یەکەم جار تێگەیشتنێکی نویٚ ی دەبێت بۆ ئایەتێك لە ئایەتەکانی خوای گەورە و لەوکاتەدا فەرمودەی خوای گەورەی دێتەوە یاد کە دەفەرموێت

(وَقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ فَتَعْرِفُونَهَا وَمَا رَبُّكَ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ) ﴿النمل: ٩٣﴾.

واتە تۆ بڵێ سوپاس بۆ خوا کە نیشانەکانی گەورەیی خۆیتان نیشان دەدات و ئێوەش دەیانناسن و خوا بێئاگا نیە لەوەی دەیکەن .

چیرۆکی من لەم زنجیرەیەدا لەو تۆژینەوانەوە دەستپێدەکات لە ئایەتەکانی قورئانەوە کە ڕایاندەگرتم و منیش هیچ ڕاڤەیەکی لۆژیکی و زانستیم پێنەبوو بۆیان ،بەلاٚم پاش گەشتێکی تۆژینەوەیی لە نێو پێگە زانستیەکان و دۆزینەوە نوێیەکانی زانستەکانی گەردوونی و فەزاییدا خۆمم دەبینیەوە کە سەرم دەتەقی بەوەی زاناکان ئەمڕۆ دەیدۆزنەوە قورئان بەو پەڕی وردی و ڕوونی ئاماژەی پێکردوە !

کاتێك زاناکان دەستیانکرد بە دۆزینەوەی گەردوون ناوی (فەزا) یان لێنا بەو بیانوەی کە گەردوون پڕە لە ( بۆشایی ) ،بەلاٚم پاش ئەوەی کە زانیاریەکانیان دەربارەی گەردوون پەرەیسەند و توانیان بونیادی گەردوونی زۆر بە وردیەکی سەرسوڕێنەڕ ببینن و چنراوی گەردوونی زۆر پێکەوەبەستراوی پتەو ببینن کە ئیتر زاراوەیەکی نوێیان بەکارهێنا بریتیبوو لە ( بناء ) ،ئەوان بەکرداری توانییان بونیادێکی ئەندازەیی زۆر پتەو ببینن ،مەجەڕەکان و کۆمەڵگاکانیان هەوێن و بنچینەی ئەو بینایەن ،ئەو مەجەڕانە و تۆزی گەردوونی و دوکەڵی گەردوونی بە هەمویان ئەو بینا زۆر مەحکەمە پێکدێنن .ئەو زانایانە زاراوەی نۆێ ی وا بەکاردێنن کە ئێمە لەسەری ڕانەهاتوین وەك پردی گەردوونی و دیواری گەردوونی و ماددەی نەبینراو هەیە کە ناویان ناوە ماددەی تاریك و ئەو ماددەیە گەردوونی پڕکردوە و دەستی بە سەر دابەشکردنی مەجەڕەکاندا گرتوە و پرد لە نێو ئەو مەجەڕانەدا دروستدەکات کە پێکیانەوە دەبەستێت .

ئەو زانایانە دەستیانکرد بەوەی زاراوەی زۆر نویٚ و نامۆ بەکاربێنن ،ئەو وێنانەی کە لە ڕێگای سوپەر کۆمپیوتەرەوە گیراون دەریانخستوە کە مەجەڕەکانی گەردوون هەر وەك سورەیاکانی سەقفی مالاٚنە و ئاسمانیان ڕازاندۆتەوە ،ئەوانە و شتی زۆری

دیکەش و بەردەوامیشن لەو دۆزینەوانانەیان .ڕۆژانە تۆژینەوەی نویٚ دەردەکەن و بە بلیۆنەها دۆلار سەرف دەکەن لە پێناوی ئەو دۆزینەوانەدا ،بەڵکو لەوە زیاتر جەخت لەسەر ئەو دۆزینەوانە دەکەن لە میانەی هەزاران تۆژینەوەی زانستیەوە کە ڕۆژانە پێگەکانی ئینتەرنێت و گۆڤار و ڕۆژنامەکان پێمانی ئاشنا دەکەن .

## لێکچوونێکی سەرسوڕمێنەر

چەندە زۆرن ئەو ئایەتانەی کە ماوەیەکی زۆر رامدەوەستێنن و منیش بە ملکەچی لەبەردەم میحرابی گەورەیی و جوانیاندات دەوەستم ،بیردەکەمەوە لە وردی بیناکردنیان و پتەویاندا ،و جوانی و سیحری شێوازیان ،بە قوڵبوونەوە بۆ نێو ماناو ئاماژەکانی شۆڕ دەبمەوە و ڕۆ دەچم بە نێو موعجیزە و سەیر و سەمەرەکانی و زانیاریەکانیدا .

من چۆن ئەو هەڵوێستەم نابێت لە کاتێکدا وام لەبەردەم گەورەترین و جوانترین و قەشەنگترین کتێب کە ئەویش ئەو کتێبەیە کە خوای گەورە زانیاریەکانی خۆی تێدا تۆمار کردوە : (لـكنِ اللّهُ يَشْهَدُ بِمَا أَنزَلَ إِلَيْكَ أَنزَلَهُ بِعِلْمِهِ وَالْمَلآئِكَةُ يَشْهَدُونَ وَكَفَى بِاللّهِ شَهِيداً) ﴿النساء: ١٦٦﴾.



وێنەی ( ١ ) کاتێك سەیری ئاسمان دەکەین لە میانەی تەلسکۆبەکانەوە ئەو بینا پتەوەی ئەستێرەکان و گاز و تۆز و دوکەڵی گەردوونیە دەبینین کە چۆن بە ڕەنگە دڵڕفێنەکانیان ئاسمانیان ڕازاندۆتەوە ،بیر بکەرەوە لە گەورەیی ئەو بینایە و ئینجا لە فەرمودەی خوا : ( أَأَنْتُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَمِ السَّمَاءُ بَنَاهَا * رَفَعَ سَمْكَهَا فَسَوَّاهَا) ﴿النازعات: ٢٧ ﴾ ،اشد خلقا واتە گرنگتر و گەورەتر دروستکراون ؟



وێنەی ( ٢ ) برای خوێنەر سەرنج بدە لە گەورەیی بینای گەردوونی بە ملیۆنەها ئەستێرە و مەجەڕە و دوکەڵی گەردوونی هەر هەموویان گەردوونیان پڕکردۆتەوە و هیچ بۆشاییەك یان هەڵەیەك یان شێواویەك نابینیت ئایا ئەوە بەڵگە نیە لەسەر گەورەیی بەدیهێنەر ،خوا دەفەرموێت :(الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَوَاتٍ طِبَاقًا مَا تَرَى فِي خَلْقِ الرَّحْمَنِ مِنْ تَفَاوُتٍ فَارْجِعِ الْبَصَرَ هَلْ تَرَى مِنْ فُطُورٍ * ثُمَّ ارْجِعِ الْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ يَنْقَلِبْ إِلَيْكَ الْبَصَرُ خَاسِئًا وَهُوَ حَسِيرٌ ) ﴿الملك: ٣-٤﴾ .

ئەوە زانیاری خوای گەورەیە کە ئاگادارە بە هەموو نهێنیەکانی گەردوون و لەو کتێبە ناوازەیەیدا ئاشکرایان دەکات وەك دەفەرموێت : (قُلْ أَنزَلَهُ الَّذِي يَعْلَمُ السِّرَّ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِنَّهُ كَانَ غَفُوراً رَّحِيماً) ﴿الفرقان: ٦﴾. واتە بڵێ ئەو خوایە ناردویەتی کە کە ئاگادارە بە نهێنیەکانی زەوی و ئاسمانەکان و هەرخۆی لێخۆشبوو وە بە بەزەییە .

ئەوەی زۆر سەیرە ئەوەیە کە قورئانی پیرۆز زۆر بە وردی باس لەو ڕاستیە گەردوونیانە دەکات کە ئەمڕۆ دەیانبینین ! ئەو بەڵگانەی کە هەستیان پێدەکەین و دەیانبینین لەم تۆژینەوەیەدا بەڵگەی زۆر بەهێزن لەسەر ئەوە،هەوڵدەدەین کە وتەی گرنگترین تۆژەرەوە و دۆزەرەوە لە سەر ئاستی جیهانی و وەك خۆی و بەو زمانەی تۆژینەوەکانی پێنوسراوە بخەینە بەر دەست کە لە پێگەکانی خۆیانەوە لە سەر

تۆڕی ئینتەرنێت وەرگیراون و هەموو خوێنەرێك دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆیان و لێیان بكۆڵێتەوە ڕاستەو خۆ ،ئینجا لە بەرامبەردا بیر لە فەرمودەی خوا دەكەینەوە و بەراوردیان دەكەین و لێیان دەكۆڵینەوە بە بێ ئەوەی كە بە زۆر ڕاڤە بسەپێنین بە سەر ئایەتەكاندا كە هەڵینەگرن ، ئەو كاتە دەبینین كە چ هاوئاهەنگیەكی تەواو هەیە لە نێوان ئەوەی زانست دەیدۆزێتەوە و ئەوەی قورئان پێش چەندین سەدە لەمەوبەر ئاماژەی بۆ كردوون ،بەڵام پێش ئەوەی ئاشنا بین بەو ڕاستیانە ئەوا پێویستە ئیستێك بكەین بەرامبەر بە یەكێك لەو ڕەخنانەی كە ئاراستەی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سونەتدا دەكرێت .

## هێرش بۆ سەر ئیعجازی زانستی

لەم دواییانەدا هەندێك ووتاری وا بلأوبونەوە كە خاوەنەكانیان پرسیار دەكەن : ئەگەر ئەو ڕاستیە زانستیە گەردوونیانە لە قورئاندا هەن هەر لە ١٤٠٠ ساڵ لەمەوبەرەوە ئەی بۆچی ئیتر چاوەڕوانی خۆرئاوادەكەن تا بیدۆزنەوە و ئینجا دەڵێن ها ئەوە قورئانە پێش ئەوان كەوتوە بە ئەوەندە سەدە و ساڵ ؟ و بۆچی بە زۆر ڕاڤەیەكی وا دەسەپێنن بە سەر دەقی ئایەتەكاندا كە هەڵیناگرن .

وەڵامی ئەو پرسیارە لە هەمان ئەو ئایەتانەدا دەبینین كە هاوئاهەنگی و هاوگونجاوی هەن لە نێوان زانست و قورئاندا ،ئەو ئایەتانە لە بنەڕەتەوە ئاراستەی بێبڕواكان كراوە ئەوانەی كە بڕوایان بەو قورئانە نیە ،خوای گەورە بەو ئایەتانە دەیاندوێنێت كە ئاماژە بەو ڕاستیانە دەكەن كە ئەو بێبڕوایانە خۆیان دەیاندۆزنەوە ،بۆیە دەبینین كە خوای گەورە دەفەرموێت : ( سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ) ﴿فصلت: ٥٣﴾. واتە نیشانەكانی توانا و دەسەلأتی خۆمانیان نیشان دەدەین لە ئاسۆكان و دەروون و جەستەی خۆیاندا تا بۆیان دەركەوێت كە ئەو قورئانە ڕاستە و بە حەقە ئایا ئەوەندە بەس نیە بۆ پەروەردگارت كە ئەو شاهیدە بە سەر هەموو شتێكەوە ؟ هەروەها خوای گەورە دەیاندوێنێت و بانگیان دەكات وەك دەفەرموێت : (أَفَلاَ يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ اللّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ اخْتِلاَفاً كَثِيراً) ﴿النساء: ٨٢﴾. واتە ئایا بۆچی بیر لە قورئان ناكەنەوە خۆ ئەگەر لە لایەن غەیری خواوە بهاتایە ئەوا جیاوازی و دژایەتی زۆریان تێدا دەبینی . بەڵام ئەگەر بینیمان هاوگونجاو و هاوئاهەنگ بوو لە

گەڵ زانستی نوێدا و هیچ دژایەتیەك نەبوو لە نێوانیاندا ئیتر ئەوە بەڵگەی زانستی دەبێت لەسەر ئەوەی کە ئەو قورئانە لە لایەن خواوەندی گەورەوەیە و هەر خۆی بەدیهێنەری گەردوون و دابەزێنەری قورئانە .

ئائەوە ئامانجی ئیعجازی زانستیە لە قورئاندا ، ببینین کە لە قورئاندا هاوگونجاوی هەیە لە هەموو شتێکدا ، هەرگیز نە هەڵەیەك یا دژایەتیەك یان کەموکورتیەکی تێدا نابینیت کە ئەوانە هەمووی سیفەتەکانی کتێبی خوای گەورەن ،بەڵام کتێبەکانی دانراوی دەستی مرۆڤ هەرچەندە هەوڵبدات لە دانانیدا ئەوا هەر بێ کەموکورتی و هەڵە و دژایەتی نابێت .

گەورەترین بەڵگەش لەسەر ئەو ڕاستیە قورئانیانە ئەوەیە کە زاناکان دەستیان بەوە کردوە کە زاراوە گەردوونیەکان بگۆڕن وەك : گۆڕینی ( فەزا ) بۆ ( بینا ) واتە ئەوان بۆیان دەرکەوتوە کە ئەوان لەو ناولێنانانەدا هەڵە بوون بۆیە ڕاستیان کردەوە بۆ ئەوەی کە زیاتر ورد و ڕاستە پاش ئەوەی کە ماددەی تاریکیان دۆزیەوە .بەڵام قورئان کە لە لایەن زاتێکەوە دابەزیوە کە ئاگادارە بە نهێنیەکانی زەوی و ئاسمانەکان گوزارشی زۆر ورد و ڕاستی ڕاستەوخۆ پێداوین وەك خۆی دەربارەی کتێبەکەی دەفەرموێت :

( لَا يَأْتِيهِ الْبَاطِلُ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِ تَنْزِيلٌ مِنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ) ﴿فصّلت: ٤٢﴾.

واتە ئەو قورئانەی کە هەرگیز و بە هیچ جۆرێك هەڵەی تێدانیە و لە لایەن خوای دانای سوپاسکراوەوە دابەزیوە . خۆ ئەگەر ئەو دۆزینەوانە لە سەر دەستی بڕواداران بەو قورئانە بوایە ئینجا بیانوتایە کە ئەوانە لە قورئانیشدا هەن ئەو کاتە گومان لای بێبڕوایان دروستدەبوو دەربارەی ڕاستی قورئان و دەیانوت کە ئەوانە ڕاست نین ،بەڵام موعجیزەکە لەوەدایە کە ئەوانەی نکوڵی لەو قورئانە دەکەن هەمان ووشە و گوزارشەکانی قورئان دووبارەدەکەنەوە بە بێ ئەوەی بە خۆیان بزانن وە ئا لێرەدا ئیعجازەکە زۆر گەورەتر دەبێت وەك لەوەی بە دەستی بڕواداران بدۆزرایەتەوە !

خۆ ئەگەر بە دواداچوون بکەین بۆ ئایەتە گەردوونیەکانی قورئان دەبینین بە زۆری ووتاری بەرەو بێبڕواکانە کە زۆر دوورن لە کتێبی خواوە و نکوڵی لەوە دەکەن کە ئەو قورئانە لە لای خواوە هاتوە ،بڕوادار بڕوای بە هەموو ئەوانە هەیە کە لە لایەن خواوە هاتوە و بەو ڕاستیە زانستیانەش بڕوا و یەقینی زیاتر دەبێت بە بەدیهێنەر و جوانکاری ئەم گەردوونە و خوای گەورە بە زمانی ئەوانەوە دەفەرموێت : (صُنْعَ اللَّهِ

الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ إِنَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَفْعَلُونَ ) ﴿النمل: ٨٨﴾. واتە ئەوانە دروستكراوانی خوای گەورەن كە زۆر بە وردی هەموو شتێك دروستدەكات و ئاگادارە بەوەی دەیكەن .
بەلأم ئەو بێبڕوایەی كە نكوڵی لەو قورئانە دەكات و بڕوای بە پەیامی ئیسلام نیە پێویستە سەیر بكات و وورد بێتەوە تا بگاتە بڕواهێنان بە قایل بوونی تەواوی خۆیەوە و با باش بزانێت كە لە پشت ئەو ڕاستیە زانستیانەوە ڕاستاندنی ئەم ئاینە و پەیامبەرەكەی هەیە كە كۆتا پەیامبەرە ( سەلامی خوای لە سەر بێت ) .

## گەورەیی گەردوون

مەجەڕەكان كە لە گەردووندا مەلە دەكەن جۆراو جۆر و هەمەچەشنەن و دەبنە هەوێنی بینای ئەم گەردوونە فراوانە ،لەگەردوونی بینراودا بە سەدان بلوێن لەو مەجەڕانە یان هەوێنانە هەن !! بەلأم لەگەڵ ئەوەشدا ئەو مەجەڕانە تەنها( ٥٪ )ی بینای گەردوونی پێكدێنن و (٩٥٪ ) ی دیكەی گەردوون ماددەی تاریكە و نابینرێن ،هەر مەجەڕەیەكیش لەوانە زیاد لە ( ١٠٠ ) هەزار ملیۆن ئەستێرەیان تێدایە گەورەیی هەر بۆ بەدیهێنەری ئەو بینا گەورەیە !!
ڕووناكی لە یەك چركەدا( ٣٠٠ ) هەزار كم دەبڕێت واتە لە یەكساڵدا نزیكەی ٥ ر٩ تریلیۆن كم دەبڕێت بۆیە ئەو مەجەڕەیەی كە یەك بلیۆن ساڵی ڕووناكی لێمانەوە دوورە ڕووناكیەكەی پێویستی بە یەك بلیۆن ساڵ دەبێت تا بگاتە لامان ! كە لەو ماوەیەدا ڕووناكی ئەو مەجەڕەیە ماوەی ٥ ر٩ هەزار ملیۆن ملیۆن ملیۆن كم دەبڕێت !!! .




وێنـەی ( ٣ ) گـەردوون لـە چـاوی تەلـسکۆبە نوێیەکانـەوە کەتێیـدا ئەسـتێرەکان و تـۆز و دوکەڵی گەردوونی دەبینرێن ،بە ڕاستی بینایەکی پتەوە بیٚ هیچ کەموکورتیەك دەبێت ئەو دیمەنە گەورەیە ببێتە هۆی زیاتر بڕوابوون بەتوانای ئەو بەدیهێنـە گەورەیـە چۆن نـا وەك خۆی دەفەرموێت : (الَّـذِينَ يَـذْكُرُونَ اللَّـهَ قِيَامًـا وَقُعُـودًا وَعَلَـى جُنُـوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِـي خَلْـقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذَا بَاطِلًا سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ) ﴿آل عمران: ١٩١﴾.
واتە ئەوانەی بە وەستاوی و بە دانیشتویی و بە پاڵکەوتنەوە بیر لە بەدیهێنانی زەوی و ئاسمانەکان دەکەنەوە و دەڵێن خوایە ئەوانەت بە خۆڕا دروست نەکردوە بێگەردی هەر بۆ خۆتە بمانپارێزە لە ئاگری دۆزەخ .



وێنــەی ( ٤ ) مەجــەڕەکان گــەردوون دەڕازێننــەوە وەك چــۆن ســورەیاکان ســەقفەکانمان دەڕازێننەوە لەم وێنەیەدا مەجەڕە دوورەکان بە ڕەنگە ڕاستیەکانی خۆیان وەدەردەکەون وەك جوانکار قورئانیش وەسفی ئەو دیمەنانەمان بۆ دەکات بە چەندین سەدە پێش ئەوەی بەر دیدی زاناکان کەوتبێ وەك دەفەرموێت : : (أَفَلَمْ يَنْظُرُوا إِلَى السَّمَاءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَاهَا وَزَيَّنَّاهَا وَمَا لَهَا مِنْ فُرُوجٍ ) ﴿ق: ٦﴾. واتە ئایا بۆچی سەیری ئاسمانی سەرو خۆیان ناکەن کە چۆن بینامان کردوە و ڕازاندومانەتەوە بە بێ ئەوەی هیچ درز و کونێکی تێدابێت

## گەردوون هەوێنی بینایە

ئێستاش نمونەیەك باس دەکەین کە بریتیە لە چەند ووشەیەك کە زانا خۆرئاواییەکان لەم دواییانەدا بەردەوام دەیلێنەوە و لە قورئانیشدا پێش سەدان ساڵ لەمەوبەر هاتووە !

لە یەکێك لە تۆژینەوەکان کە لە ڕوانگەی ئەورووپی باشورەوە دەرچوە گروپێك لە زاناکان ڕایانگەیاند کە وا بە باش دەزانن گوزارشی ( هەوێنەکانی بینا لە مەجەڕەکان ) بەکاربێنن لە جیاتی ( مەجەڕەکان ) و جەخت لەوە دەکەنەوە کە گەردوون بەو بینایانە ڕازێندراوەتەوە هەروەك چۆن موروو ڕیز دەکرێت لە سەر ملوانکە یان دەزوو

!

لەو تۆژینەوەیەدا دکتۆر ( پۆڵ میلەر ) کە خۆی و هاوڕێکانی ڕستی چنراوی گەردوونیان دۆزیوەتەوە بە یەك دەنگ دەڵێن :( مەجەڕە یەکەمینیەکان یان هەوێنەکانی بینای یەکەمی لە مەجەڕەکان شێوەی دەزوو لە چنراوێکدا پێکدێنن و کاتێك دەستدەکەن بە ڕووناکی ناردن وەك موروو دەدرەوشێنەوە کە بە دەزوویەکی نەبینلراوەوە بن کە تا ڕادەیەکی زۆر لە موورووی ملوانکە دەچن )

## ئاسمان بینایە

منیش پاش ئەوەی خۆم خستە نێو دەریایەك لە ووتار و تۆژینەوەی زانستی کە تازە بە تازە دەربارەی گەردوون و پێکهاتەی دەرچووبوون دڵنیا بووم لەوەی کە ئەو زانایە تاکە زانا نیە کە بڕوای وابێت ،بەڵکو هەموو زاناکان جەخت لە ڕاستی بینای گەردوونی دەکەنەوە و کەم ڕێدەکەوێت کە ووتارێك یان تۆژینەوەیەك لە زانستی گەردوونیدا نـــاوی ( بینای گەردوونی ) نەهێنێت ئەوەش بەڵگەی ئەوەیە کە زاناکانی ئەمڕۆ کۆکن لەسەر ڕاستی بینای گەردوونی ئینجا ڕاستەوخۆ چووم بەرەو کتێبی ڕاستیەکان ( قورئان ) و بە دوای ووشەی ( بناء ) دا و ماناکانیدا دەگەڕام و لە پڕدا بۆم دەرکەوت کە ئەو ووشەیە وەك سیفەتی ئاسمان لە قورئاندا ئاماژەی پێکراوە وەك دەفەرموێت : (اللَّهُ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ قَرَاراً وَالسَّمَاء بِنَاء وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَرَزَقَكُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ فَتَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ) ﴿غافر: ٦٤﴾ ، یان لە ئایەتێکی دیکەدا دەفەرموێت :(الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ فِرَاشًا وَالسَّمَاءَ بِنَاءً ) ﴿البقرة: ٢٢﴾.

پاکی و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە ووشەیەکی لە قورئانەکەیدا بەکارهێناوە لە سەدەی حەوتی زایندا و زاناکان لە سەدەی ٢١ هەمدا هەمان ئەو ووشانە بە تەواوی وەك خۆیان بەکاردەهێننەوە پاش ئەوەی بۆمان دەرکەوت کە ئەو ووشانە گوزارشی ڕاستی و زانستین دەربارەی گەردوون کە بە ڕاستی بینایەکی موحکەم و پتەوە ئایا ئا ئەوە ڕێکەوتە یان موعجیزەیە !!!؟ (قُلِ انْظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا تُغْنِي الْآيَاتُ وَالنُّذُرُ عَنْ قَوْمٍ لَا يُؤْمِنُونَ) ﴿يونس: ١٠١﴾

## مرواریەکان ملوانکە دەڕازێننەوە !

کاتێك زاناکان ئەم گەردوونەیان لە ڕێگای تەلسکۆبەکانیانەوە یان گەورەکارەکانیانەوە بینی و بینیان چی تێدایە لە ئەستێرە و مەجەڕە و تۆزی گەردوونی ئەوا خۆیان بینیەوە لە بەردەم بینایەکی ئەندازەیی گەردوون بۆیە بە پەلە زاراوە ( البناء ) یان بەکارهێنا بۆ ئەو ژمارە زۆرەی ئەستێرە و مەجەڕە و دوکەڵ و تۆزی گەردوونیە و لە نێوانیاندا ڕەنگی جوان و دڵڕفێنیان بینی بۆیە چواندیان بە مرواری !



وێنەی ( ٥ ) ماددەی تاریك کە زیاد لە ٩٥ ٪ ی قەوارەی گەردوونی پێکهێناوە ،ئەو ماددەیەی کە نابینرێت بەڵام بوونی هەیە و دەست بەسەر دابەشبوونی ماددەی بینراوی نێو گەردووندا دەگرێت و ماددەی بینراویش کەمتر لە ٥ ٪ ی قەوارەی گەردوون دەگرنەوە ئالێرەدا گەورەیی قورئان دەردەکەوێت کە ئاسمان بە ( بناء ) ناو دەبات نەك( فضاء ) .

هەر لە قسەی زاناکانەوە کاتێك باس لە بینای گەردوونی دەکەن دەبینین کە ئەوان باس لە چواندنێکی نویٚ دەکەن ئەویش ئەوەیە کە مەجەڕەکان و کۆمەڵگاکانیان دیمەنێکی زۆر جوان بە هەموو ڕەنگەکانیانەوە وەك شین و زەرد و سەوز هەروەك دەنکە موورووی ملوانکە یان وەك مرواری ڕیزکراو لە سەر دەزوو واتە ئەو زانایانە وا دەبینن کە بیناکە ڕازاوەیە .

لە یەکێك لە ووتارە زانستیەکانی یەکێك لە زانا گەورەکاندا هاتوە کە زۆر بە ڕاشکاوانە باس لەو جوانیەی ئەو بینایە دەکات کە بە چاوی خۆی دیویەتی ودەڵێت: (ماددەی گەردوونی ڕستێکی چنراو پێکدێنن کە مەجەڕەکان بە درێژایی ماددەی ئاسایی و ماددەی تاریك ڕیز دەبن هەروەك چۆن مرواری لەسەر ملوانکە ڕیزدەکرێن)



وێنەی ( ٦ ) مەجەڕەیەکی لولپێچی بە گەردووندا دەڕوات بە پیٚ ی سیستمێکی موحکەم و پتەو و زیاد لە ١٣٠ هەزار ساڵی ڕووناکی لێمانەوە دوورە !! لە گەردووندا زیاد لە ١٠٠ هەزار ملیۆن مەجەڕە هەیە کە گەورەترن یان پچوکترن لەم مەجەڕەیە .ئاسمان وەك زاناکان

دەڵـێن بینایـەکی پتـەوە بـەڵکو ئاسمـان لـە بینـاش بینـاترە ئـەوەتا خـوای گـەورە سـوێند دەخوات بەو بینا موحکەمە ( وَالسَّمَاءِ وَمَا بَنَاهَا ) ﴿الشمس: ٥﴾.

واتە زاناکان لە تۆژینەوەکانیاندا پرسیار لە چۆنیەتی بیناکردنی گەردوون دەکەن ئینجا دان بە بوونی ئەو بینا موحکەمە دا دەنێن ،و باس لە جوانی ئەو بینایە دەکەن و دان بەوەشدا دەنێن کە گەردوون پڕە لە ماددەی ئاسایی بینراو و نەبینراو واتە هیچ بۆشاییەك یان درز و کەلەبەرێك نیە منیش بینیم کە قورئان بە تەواوی وردی و هاوگونجاویەکی سەرسوڕهێنەرەوە باس لەو ڕاستیانە دەکات لە تەنها یەك ئایەتدا !!!

لەوەش سەیرتر ئەوەیە کە ئەو ئایەتە بێبڕوایان واتە ئەوانەی گاڵتەیان بە قورئان دێت دەدوێنێت ،دەیاندوێنێت بەڵکو بانگیشیان دەکات بۆ لێوردبوونەوە و بیرکردنەوە و تۆژینەوە لە چۆنیەتی دروستکردنی ئەو بینا و جوانیە گەردوونیە و بیرکردنەوە لە چۆنیەتی ئەو جوانیە وەك ئاماژەیەك بۆ بەتەواوی بۆ ماددەی تاریك وەك ئەوەی دەیبینن!!

خوای گەورە دەفەرموێت : (أَفَلَمْ يَنظُرُوا إِلَى السَّمَاء فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَاهَا وَزَيَّنَّاهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ ) ﴿ق: ٦﴾.واتە بۆچی سەیرێکی ئاسمانی سەروو خۆیان ناکەن تا بزانن چۆن بیناکراوە و چۆن ڕازێندراوەتەوە کە هیچ درز و بۆشاییەکی تێدانیە .

ئەمڕۆ ئێمە لە میانەی ئەو وێنانەی بینای گەردوونی کە بۆ زاناکان دەرکەوتوە لە بەرهەمی گەورەترین پرۆسەی کۆمپیوتەریەوە لەو وێنانەوە مەجەڕەکان وەك هەوێنی بیناکردن کە ئاسمانیان ڕازاندۆتەوە دەردەکەوێت و ماددەی تاریکیش بە ڕەنگی ڕەش دەردەکەوێت .

واتە بیر لە قسەی زاناکان بکەرەوە کە ئاسمان بینایە و ڕازاوەیە و هیچ بۆشایی و درز و کەلەبەری تێدا نیە ئینجا بەراوردی بکە لەگەڵ فەرمودەی خوای گەورە (أَفَلَمْ يَنظُرُوا إِلَى السَّمَاء فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَاهَا وَزَيَّنَّاهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ) ﴿ق: ٦﴾. ئایا ئەوەی لە ئایەتەکەدایە بە تەواوی ئەوە نیە کە زاناکان بینیویانە بە نوێترینی ئامێرەکانیان !؟

برای خوێنەرم سەرنج بدە کە چۆن ئەو زانایانە لە تازەترین دۆزینەوەکانیاندا باس لە چۆنیەتی بینای مەجەڕەکان دەکەن و چۆن دروستدەبن و چۆن ئاسمانیان ڕازاندۆتەوە وەك مرواری سەر ملوانکە ! هەتا ئەو بۆشاییەی نێوان مەجەڕەکان کە

زاناكان وايان دەزانی كە بۆشايی تەواوە و هيچی تێدانيە بەڵام وا دەردەكەوێت كە ئەوە بۆشايی نيە و پڕە لە ماددەی تاريك ئەمەش ئەوە دەردەخات كە ئاسمان هيچ درز و كەلەبەر و بۆشايی تێدا نيە كە ئەوەش بە تەواوی لەگەڵ دەقە قورئانيەكەدا دەگونجێت .

## ووشە قورئانيەكان لە زاراوەكانی خۆرئاوادا

گەورەيی و بێگەردی بۆ ئەو خوايەی كە ئەو قورئانەی ناردوە خوای گەورە داوا دەكات كە سەيری ئاسمان بكەن بە سەرووويانەوە و بگەڕێن بە دوای چۆنيەتی ئەو بيناكردن و ڕازاندنەوەيە و ئەوان خۆيان باس لەو بيناكردن و ڕازاندنەوەيە دەكەن كە بە ڕوونی دەيبينن ،ئەوان باس لە شێوەی ئەو مەجەڕانە دەكەن كە وەك موروو وايە و ملوانكە دەڕازێنێتەوە و دەبينين لە تۆژينەوەكانياندا هەمان ووشەكانی قورئان بەكاردێنن ئەوەش ئەوەيە كە قورئان دەربارەی دەفەرموێت (كَيْفَ بَنَيْنَاهَا) !!

لەو بابەتانەی كە تازە دەردەچن ئەو زانايانە پرسيارێك دەوروژێنن كە بە هەمان ووشەی قورئانی دەست پێدەكات ( چۆن بينای گەردوونی دروست بوە ) كە هەمان ووشەی قورئان بەكار دەهێنن ( كيف) واتە چۆن ؟ خۆ ئەگەر ئەو ووتارانە بخوێنينەوە دەبينين كە باس لە بونيادی گەردوونی دەكەن هەروەك چۆن قورئانی پيرۆز باسی دەكات ،هەتا ئێمە لەم سەدەی بيست و يەكەمەدا دەبينين كە خەڵات دەبەخشرێت لە پێناو وەڵامدانەوەی ئەو پرسيارەی كە لە( ١٤ ) سەدە لەمەوبەرەوە قورئان ورووژاندويەتی ئايا ئا ئەوە ئيعجازێكی گەورەی قورئانی پيرۆز نيە ؟

بەڵام ئەوەی زۆر واقی منی وڕماندوە لێوەرگيراوەكانی ووشەی ( بناء )،ئەو زاراوانەی كە زاناكانی ئەمڕۆ بەكاری دەهێنن و جەختی لێدەكەنەوە لە تۆژينەوەكانياندا و ئەمڕۆ پێيگەيشتون ئەوا قورئان پێش ئەوان كەوتوە زۆر بە وردترو ڕوونتر و جوانتر .

ئەگەر بە نێو كتێبی خوادا گەڕاين و سەرنجی ئەو ئايەتانەمان دا كە باس لە بيناكردنی گەردوون دەكات ،دەبينين كە ڕوونكردنەوەی خوايی هەميشە جەخت لە سەر ڕاستی ئەو بيناكردنە بەهێز و تۆكمەيەی گەردوون دەكاتەوە وەك دەفەرموێت (أَأَنْتُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَمِ السَّمَاءُ بَنَاهَا) ﴿النازعات: ٢٧﴾. واتە ئايا دروستكردنی ئێوە گرانتر و گەورەترە يان ئەو ئاسمانەی كە بينای كردوە ؟

زاناکان جەخت لەوە دەکەنەوە کە ئەو هێزانەی لە گەردووندا هەن زۆر لەوە گەورەترن کە ئێمە بۆیان دەچین ،خوێنەری بەڕێز دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ ئەو سەرچاوانەی کە ئێمە لە کۆتایی ئەم توێژینەوەیەدا پاشکۆمان کردوون تا بیرۆکەیەك وەربگرێت دەربارەی گەورەیی ئەو هێزانەی کۆنترۆڵی گەردوون دەکەن ،لەو ئایەتەی پێشوودا لە میانەی ووشـــەی (اشد )مانای گەوریی ئەو هێزانە وەدەردەکەوێت ،بەڵکو بۆ جەختکردن لە سەر ئەو ڕاستیە خوای گەورە سوێند بەو بینایە دەخوات وەك دەفەرموێت : (وَالسَّمَاءِ وَمَا بَنَاهَا) ﴿الشمس: ٥﴾. و خوای گەورە سوێند ناخوات بە شتی زۆر گەورە نەبێت ..

ئەوەتا یەکێك لە زانا خۆرئاواییەکان سورە لە سەر ئەوەی کە گەردوون بینای گەردوونی زۆر گەورە و قایم و توند و تۆڵە وەك دەڵێت : ( ڕوونترینی هەموو ئەو ڕاستیانەی کە دەربارەی گەردوون هەن ئەوەیە کە ئەو بیناکردنەی گەردوون بە هەموو پێوەرەکان دەرکەوتوە کە زۆر دەوڵەمەندە لە بیناکەیدا بە هەسارە و ئەستێرە و مەجەڕەکان و هەتا کۆمەڵەی مەجەڕەکان و مەجەڕە زۆر گەورەکان کە بە چەندین ملیۆن ساڵی ڕووناکی درێژدەبن

## ئیعجازی زانستی بەرزترین شێوازی دواندنی بێبڕواکانە

هەندێك لە زاناکان نکوڵی لە ووتاری خوایی کە قورئانی پیرۆزە دەکەن و دەڵێن ئەو قورئانە دانراوی موحەممەدە ( د.خ ) !!! و لەوانەیشە ئەوانە هەر بڕوایان بە بوونی خوای گەورەش نەبێت چونکە ئەوان لە بارێکی پشێوی تێکەڵی و پێکەڵیدا دەژین ،ئەوەی سەیرە ئەوەیە کە خوای گەورە باس لەو بارەی ئەوانە دەکات وەك دەفەرموێت : (بَلْ كَذَّبُوا بِالْحَقِّ لَمَّا جَاءَهُمْ فَهُمْ فِي أَمْرٍ مَرِيجٍ) ﴿ق: ٥﴾. واتە ئا ئەوانەی کە بڕوایان بەو قورئانە نیە وان لە سەرسوڕماوی و پشێوی و تێکەڵی و پێکەڵی هزر و بیرو ناجێگیری دەروونی .بەڵام لەگەڵ ئەوانەشدا هەر خوای گەورە ڕاستەوخۆ بانگیان دەکات بۆ تێڕوانین و بیرکردنەوە لە چۆنیەتی بیناکردن و جوانکردنی ئەم گەردوونە و جەخت دەکاتەوە بۆ ئەوانە کە هەر خۆی واتە خوای گەورە ئەو مەجەڕانەی دروستکردوە و ئەو جوانسازیەی تێدا ئەنجامداوە وەك دەفەرموێت :

(كَيْفَ بَنَيْنَاهَا وَزَيَّنَّاهَا) ، بگرە لەوەش زیاتر خوای گەورە هەموو هۆكانی تێڕوانین و دۆزینەوەی بۆ فەراهەم هێناون تا لەو ڕێگایەوە بەدیهێنەری ئەو بینا گەردوونیە قەشەنگە بناسن تا لەو بارە واق وڕماوی و پشێویە دەروونیە دەربچن و بڕوا بێنن بەو بەدیهێنەرە بەتوانا و كاربەجێیە ، ئایا ئەوە بانگكردن نیە لە لایەن خوای گەورەوە و بە زمانی زانست بۆ بڕواهێنان بەو بەدیهێنەرە بالاَدەستە ؟

ئیسلام ئابەو جۆرە مامەڵە لەگەڵ ناموسڵمانەكان دەكات بۆ قایلكردنیان ئاخۆ ئەوە ئاینی دواكەوتوویی و تۆقاندنە یان ئاینی زانست و لێبوردەیی و قایلكردنە ؟

ئەگەر ئابەو شێوازە زانستیە و بە دەرخستنی ئیعجازی زانستی لە قورئاندا گوتاری خوای گەورە بێت بۆ بێبڕواكان ،ئیتر دەبێت چ زمانێك ئەوانە بدوێنێت و یان بە مانایەكی دی بەكام زمان ئەو بێبڕوایانە بدوێنرێن لەم سەردەمەی زانست و تەكنۆلۆژیەدا و هەندێكیش لەو بێبڕوایانە وابەستەی ئەو زانست و تەكنۆلۆژیایەن .

خوای گەورە دەفەرموێت : (ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنْ ضَلَّ عَنْ سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ) ﴿النحل: ١٢٥﴾. واتە بانگهێشتی خەڵك بكە بۆ ڕێگای خوا بە دانایی و پەند و ئامۆژگاری جوان و بە باشترین شێوە وتووێژیان لەگەڵدا بكە خوای گەورە خۆی دەزانێت كە كێ گومڕایە و كێ ڕێنومایی كراوە .

## لە ئامێزی ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا

ئیمامی تەبەری ڕەحمەتی خوای لێبێت لە ڕاڤەی مانای ( البناء )دا دەفەرموێت :

" فەرمودەی خوای گەورە ( أَفَلَمْ يَنْظُرُوا ) ئەوە دەگەیەنێت كە ئاخۆ ئەوانەی بڕوایان بە زیندوبوونەوەی پاش مردن نیە و نكوڵی لە توانایی خوا دەكەن بۆ زیندوو كردنەوەیان پاش مردن ئاخۆ ئەوانە سەیری ئاسمان ناكەن چۆن بیناكراوە و ڕازێندراوەتەوە (إِلَى السَّمَاءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَاهَا وَزَيَّنَّاهَا) چۆن خوای گەورە ئەو ئاسمانەی كردۆتە سەقفێكی پارێزەر و ڕازاوە و بێ ئەوەی هیچ درز و كونێكی تێدابێت كە ئایەتی (وَمَا لَهَا مِنْ فُرُوجٍ ) ئاماژە بەوە دەكات ."

ئیمامی قورتوبی لە مانای ئایەتی (أَفَلَمْ يَنْظُرُوا إِلَى السَّمَاءِ فَوْقَهُمْ ) دا دەفەرموێت :

" واتە سەیركردنی بیركردنەوە و بە هەند وەرگرتن ،ئەوەی بەدیهێناوە دەتوانێت

جارێکی دی دووبارەی بکاتەوە (كَيْفَ بَنَيْنَاهَا )واتە چۆن بەرزی کردۆتەوە بە بێ ستوون (وَزَيَّنَّاهَا ) واتە ڕازانومانەتەوە بە ئەستێرە (وَمَا لَهَا مِنْ فُرُوجٍ )  فروج کۆی فرج واتە درز ، و کسائی دەفەرموێت هیچ جیاوازی و ناڕێکی و درزی تێدانیە ."
لە ڕاڤەی تەبەریدا دەفەرمویت :" بۆ قسە لەسەر مانای فەرمودەی خوا (وَالسَّمَاءَ بِنَاءً) ، ئەبو جەعفەر دەفەرموێت :بۆیە ناوی (السماء) بەکارهێنراوە کە بە مانای ئاسمانە واتە هەموو شتێکی بەرزبوەوە لە سەرو زەویەوە و لەسەرو دانیشتوانی سەر ڕوی زەویەوە ،هەر شتێك لە سەرو شتێکی ترەوە بێت ئەوە بە ئاسمان دەناسرێت بۆ ئەوەی خوارەوەی بۆیە بە سەقفی مالأن دەوترێت ( سماوة ) چونکە لە سەرویەوەیەتی و لە قەتادەوە کە دەربارەی(وَالسَّمَاءَ بِنَاءً) وتویەتی ئاسمانی کردۆتە سەقف بۆ تۆ "  .
ئایا ئەوەی کە ڕاڤەکارانی پێشوی قورئانی پیرۆز پێیگەیشتون هەمان ئەوە نیە کە زانستی نوێی ئەمڕۆ دەیدۆزێتەوە ؟ ئایاگەردوون بە مادده پڕنەبۆتەوە ؟ ئایا ئەستێرە و مەجەڕەکان ئاسمانیان نەڕازاندۆتەوە ؟ ئایا ئەو ئاسمانە بێ درز و کەلەبەر و بۆشایی نیە و ئەوانە هەموو جەخت لە ڕوونی و ڕاشکاوی دەقی قورئان دەکەنەوە و هەرکەس ئەو قورئانە بخوێنێتەوە ئەوا بە پێ ی پسپۆڕی و زانیاری خۆی هەست بەو ڕاستیانە دەکات .

## گۆڕانکاریەکانی ڕاستیە زانستیەکان

لە سەدەی حەوتەمی زایندا کاتێك کە قورئان دابەزیە خوارەوە ئەوە لای خەڵکی لە ئارادابوو کە زەوی ناوەندی گەردوونە و ئەستێرە و هەسارەکان بە دەوری زەویدا دەسوڕێنەوە ،هیچ کەس زانیاری نەبوو دەربارەی بینای گەردوونی و پەیدابوونی و پەرەسەندنی ،هیچ کەس ئەو ژمارە خەیاڵیانەی مەجەڕەکانی بە خەیاڵدا نەدەهات و کەسیش دەربارەی بینای ئەو مەجەڕانە هیچی نەدەزانی .
بار هەر بەو جۆرە مایەوە ڕاپەڕینی زانستی نوێ هاتە کایەوە کاتێك زاناکان لە ڕێگای تەلسکۆبەکانیانەوە سەیری ئاسمانیان دەکرد و زانستی گەردوونی زیاتر پێشکەوت کاتێك کاتێك زاناکان هۆکانی شیکاری شەبەنگی ڕووناکی مەجەڕە دوورەکانیان بەکارهێنا ،ئینجا سەردەمێك دەستی پێکرد کاتێك تۆژەرەوەکان

تەکنیکی چارەسەرکردنیان بە کۆمپیوتەر بەکارهێنا بە مەبەستی دەستکەوتنی زانیاری زیاتر دەربارەی گەردوون .
بەلأم لە سەرەتای هەزارەی سێیەمدا زانستی فەزایی پێی نایە قۆناغێکی نوێوە لە ڕێگای بەکارهێنانی سۆپەر کۆمپیوتەرەوە ،کاتێك زاناکان وێنەی هێڵکاری گەردوونیان بە سێ دووری بە دەستهێنا و لە ئەنجامی ئەوەشدا زاناکان بە دڵنیایی تەواوەوە گەیشتنە ئەوەی کە هەموو شتێك لەم گەردوونەدا بریتیە لە بینایەکی موحکەم و بەهێز . بەلأم ئەوەی کە سەرنجی من ڕادەکێشێت و زۆر لەسەری دەوەستم ئەو وەسفەی خوای گەورەیە بۆ ئەستێرەکان کە دەفەرموێت : ( وَزَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَحِفْظًا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ) ﴿فصلت: ١٢﴾. من بە ڕاستی سەرسوڕماو بووم کە کاتێك بینیم زاناکان وێنەی ئەستێرە و کوازاری (نیمچە ئەستێرە)ی وا پرشنگداریان گرتوە کە بە ڕاستی ڕێگای نێوان ئێمە و خۆیان ڕووناك دەکاتەوە بۆیە ناوی ( المصابیح ) یان لێناوە واتە گڵۆپەکان، بەڵێ گەورەیی بۆ ئەو خوایەی کە زۆر پێش ئەو زانایانە ئەو وەسفە جوانەی بەکارهێناوە (وَزَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ﴾!

## ئاخۆ کێ موحەمەدی فێری ئەو ووشانە کردوە ؟

لەم تۆژینەوەیەدا ئەو پرسیارە زۆر دووبارە دەبێتەوە کە ئەگەر ئەو قورئانە لە دانراوی دەستی موحەمەد ( د.خ ) بێت ئەوا چۆن ئەو پەیامبەرە نەخوێندەوارە ئەو پرسیارە لە بێبڕواکان دەکات و بانگیان دەکات بۆ تێڕوانین لە چۆنیەتی بنیاتنانی گەردوون ؟! هەروەها چۆن ئەو توانویەتی باس لەوە بکات کە ئەستێرەکان ئاسمانیان ڕازاندۆتەوە و لە کوێوە ئەو زاراوە زانستیانەیان هێناوە وەك ( بناء ، مصابیح ) !؟ لەوە زیاتر ئەو چۆن زانی کە لە گەردووندا بۆشایی و درز و قڵیش نین ؟! کێ ئەو زاتەی فێری ئەو هەموو زانستە گەردوونیانە کرد لە سەردەمێکی دواکەوتوی وەك ئەوەی موحەمەد تێیدا ژیاوە ؟ لە ڕاستیدا بوونی ئەو زاراوە زانستیانە لە قورئانی پیرۆزدا بۆ خۆی بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگرە لە سەر ئەوەی کە ئەو قورئانە ئیعجازی زانستی تێدایەوە و لە لایەن خوای بە دەسەلأتەوە دابەزیوە .

## قورئان یەکەمین کتێبە
## کە بینای گەردوونی بە فراوانبوونیەوە دەبەستێتەوە

لە قورئانی پیرۆزدا تێبینی ئەوە دەکەین کە هەمیشە ووشەی ( بناء ) بەستراوەتەوە بە ووشەی ( السماء ) و هەروەها ووشەکە بەستراوەیە بە ڕازاوەیی گەردوون و فراوانبوونیەوە وەك خوا دەفەرموێت : (وَالسَّمَاءَ بَنَيْنَاهَا بِأَيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ) ﴿الذاريات: ٤٧﴾. واتە ئێمە خۆمان ئاسمانمان بینا کردووە بە توانایی و دەسەڵاتی خۆمان و هەر خۆشمان فراوانی دەکەین ،ئەوەی سەیرە ئەوەیە کە بە هیچ جۆرێك تۆژینەوەیەك نابینین کە باس لە بیناکردنی گەردوون بکاتەوە و باس لە فراوانبوونی نەکات !!ئەمەش ئەوەیە کە قورئان زۆر بە ووردی ئاماژەی بۆ کردوە بە دوو ووشەی (بَنَيْنَاهَا) وە (لَمُوسِعُونَ)، ئەوەش مانای وایە کە قورئانی پیرۆز یەکەم کتێبە کە بینای گەردوونی بەستۆتەوە بە فراوانبوونیەوە و خوێنەری بەڕێزیش دەتوانێت سەردانی هەندێك لەو بابەتانە بکات کە لە کۆتایی ئەم دانراوەدا ئاماژە بۆ سەرچاوەکانیان کراوە تا زیاتر دڵنیا و شارەزا بێت لەو پەیوەندیە لە سەرچاوە زانستیە نوێیەکانەوە . ئینجا ئەو پرسیارە دووبارە دەکەینەوە کە مانای چییە زاناکان هەمان گوزارش و ووشەی قورئانی بەکار دەهێنن ؟ ئەوە مانای ئەوەیە کە قورئان دەیەوێت دەریبخات بۆ ئەوانەی کە گومانیان لەو قورئانە هەیە ئەوا هەرچەندە هەوڵ بدەن دەبێت لە کۆتاییدا هەر هەمان ووشە قورئانیەکان بەکاربێننەوە!!!

## قورئان دیاری دەکات کێ بینای گەردوونی دەدۆزێتەوە

لە ڕاستیدا ئاماژەیەکی زۆر گرنگ لە ئایەتەکاندا هەیە کە کێن ئەوانەی کە ڕاستی بینای گەردوونی دەدۆزنەوە ، بۆیە لە هەموو ئەو ئایەتانەی کە ئاماژە بە بینای گەردوونی دەکەن گوتاریان ئاراستە دەکرێت و دەبینین کە گوتارەکانیش بۆ ئەوانەیە کە گومانیان لە قورئان هەیە تا لە ڕێگای دۆزینەوەکانیانەوە ڕێگای خوا و بڕوابوون بە دواپەیامە نەمرەکەی بە دەست بێنن ، سەرنج بدە لەو بانگەوازە خواییەی کە خەڵکی بانگ دەکات بۆ پەرستنی خوای گەورە و بینای ئاسمانیان بیر دەخاتەوە :
(يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ * الَّذِي جَعَلَ

لَكُمُ الْأَرْضَ فِرَاشًا وَالسَّمَاءَ بِنَاءً وَأَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقًا لَكُمْ فَلَا تَجْعَلُوا لِلَّهِ أَنْدَادًا وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ ) ﴿البقرة: ٢١-٢٢﴾.
واتە ئەی خەڵكینە ئەو پەروەردگارەتان بپەرستن كە ئێوە و ئەوانەی پێش ئێوەشی دروستكردوە تا خۆپارێز بن .ئەو پەروەردگارەی كە زەوی بۆ ڕاخستوون وەك ڕاخەرێك و ئاسمانیشی بۆ بیناكردوون و لە ئاسمانەوە ئاوتان بۆ دادەبەرێنێت بەوەش میوەی جۆراو جۆرتان بۆ بەرهەم دێنێت و ڕۆزیتان دەدات دەی ئێوەش هاوبەش بۆ خوا بڕیار مەدەن كە ئەوە دەزانن .هەروەها قورئان باس لە نكوڵی بێبڕواكان دەكات بۆیە بیناكردنی ئاسمانیان وەبیر دێنێتەوە : (كَذَلِكَ يُؤْفَكُ الَّذِينَ كَانُوا بِآيَاتِ اللَّهِ يَجْحَدُونَ * اللَّهُ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ قَرَارًا وَالسَّمَاءَ بِنَاءً وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَرَزَقَكُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ فَتَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ) ﴿غافر: ٦٣-٦٤﴾. يؤفك واتە هەڵیدەبەستن .
ئیتر بەو جۆرە قورئان لە چەندین ئایەتدا سەرنجی بێبڕوایان ڕادەكێشێت بۆ چۆنیەتی بەدیهێنان و بیناكردنی گەردوون : ( أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ أَمْ عَلَى قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا) ﴿محمد: ٢٤﴾.واتە بۆچی بیر لە قورئان ناكەنەوە یان دڵەكانیان قفڵی لێدراوە؟

## سوێند بە ئاسمانی چنراو

ئێستا با بچینە سەر یەكێك لە تازەترینی دۆزینەوە زانستیەكان دەربارەی چنراوی گەردوونی یان شانەی گەردوونی ،و چۆن مەجەڕە و كۆمەڵەكانیان شانەیەكی پێكەوەبەستراوی توند و تۆڵ هەروەك ڕستێكی چنراو لە دەزوو پێكدێنن ئینجا ئاماژە بەوە دەكەین كە چۆن خوای گەورە لە قورئانەكەیدا باس لەو ڕستە چنراوە دەكات : (وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْحُبُكِ) ﴿الذاريات: ٧﴾. ئەوكاتە دەبینین كە چۆن ڕاستیە زانستیە جێگیرەكان خۆیان لەگەڵ ئاماژە قورئانیەكاندا دەگونجێنن ، ئەو خۆگونجاندنەش بەڵگەی ئەوەیە كە ئەو قورئانە نێردراوی خوای گەورەیە و موعجیزەیە لە هەموو ڕوەكانیەوە و لەوانەش لە ڕووی زانستی و گەردوونیەوە !
لەم بابەتەدا پشت دەبەستین بە لێكۆڵینەوەكانی سەرچاوە زانستیەكان كە لە لایەن زانایانی خۆرئاواوەوە ئەنجامدراون و ئەو چنراوە گەردوونیەیان دۆزیوەتەوە و بە سەدان تۆژینەوەیان لە سەر نوسیوە و لە لایەن زۆر لە سایتە هەرە گەورە

جیهانیەکانەوە ڕاستاندنی بۆ کراون وەك سایتی ئاژانسی فەزایی ئەمەریکی (ناسا) .

## ڕاڤەی ووشەی " الحبك"

منیش بڕیارم دا کە بگەڕێمەوە بۆ ووتەی ڕاڤەکاران ڕەحمەتی خوایان لێبێت و بۆم دەرکەوت کە زۆربەی ئەوان وا لە ووشەکە گەیشتوون کە "الحبك" بە مانای ڕستێکی چنراوی زۆر توند و تۆڵ دێت و دەڵێن کە فەرموودەی خوا (وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْحُبُكِ) بە مانای ئەوە دێت کە شێوەیەکی جوان و توند و تۆڵ و دڵڕقێن دەگرێتەوە، ئەوەتا ئیمامی قورتوبی ڕەحمەتی خوای لێبێت قولڵ دەبێتەوە لە مانای "الحبك" و ٧ مانای لێ هەڵدەگۆزێت : یەکەم : ئیبن عەباس و قەتادە و مجاهد دەڵێن ئەوە دروستکراوی ڕێکوپێکە کە عەکرەمەش هەر وای وتوە و ئەو دەڵێت ئایا نابینیت کە ئەو کەسەی قوماشێك دەچنێت (جۆلا) چۆن بە چاکی و جوانی دەیچنێت و لە زمانی عەرەبیدا دەوترێت " حبك الثوب یحبِکه حبکاً " واتە بە چاکی چنیویەتی ،ئیبن ئەعرابیش دەفەرموێت هەر شتێك بە توند و تۆڵی و جوانی دروستکرا ئەوە لە زمانی عەرەبیدا دەوترێت " احتبکته " .

دووەم : بە واتای جوانی دەگرێتەوە کە حەسەن و سەعیدی کوڕی جەبیر وای بۆ چوون . و سێیەم : ئەوەیە کە حەسەن وتویەتی ئەستێرە دەگرێتەوە .

چوارەم : قسەی فەڕائە کە "الحبك" واتە هەموو شت دەشکێنێت وەك چۆن با لم و خۆڵ دەبات و ئاوی وەستاو دەجوڵێنێت . پێنجەم : زۆر بەهێز ئیبن زەید وای فەرمووە و ئایەتی (وبَنَيْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعاً شِدَاداً)[النبأ: ١٢] دەخوێنێتەوە(المحبوك) بە مانای زۆر بەهێز و بە توندی دروستکراوە .لە سونەتیشدا هاتوە کە عائیشە (خوای لێڕازیبێت )کـــە ( تحتبك تحت الدرع فی الصلاة ) واتە زۆر بە توند و تۆڵ و قایمی گرتویەتی . شەشەم : خەصیف وتوویەتی :بە مانای ڕوونی و کراوەیی دێت وەك پۆشاکێکی ڕوون یان بەرگێکی ڕوون و یان ڕوویەکی گەشاوە و ڕوون و جوان دێت . حەوتەم :بەمانای ڕێگای کاکێشان دێت کە لە ئاسماندا هەیە چونکە وەك شوێنەواری کا دەردەکەون .

## ئەو چنراوە لە کوێدایـــە ؟

بەڵام من ئەو پرسیارەم لە خۆم دەکرد ئاخۆ ئەو چنراوە توند و تۆڵە لە ئاسماندا لە کوێدایە ؟ خۆ ئێمە لە ئەستێرە و هەسارەکان زیاتر نابینین ،بۆیە گەڕام بە نێو هەندێك لەو سەرچاوانەی کە باس لە گەردوون و بونیادی گەردوون دەکەن و لەو کاتانەدا هیچی وام دەست نەکەوت دەربارەی ئەو چنراوە .

ئەو ئایەتەی باس لەو چنراوە دەکات هەروا مایەوە لە مێشکمدا بۆ ماوەی چەند ساڵێك تا تا چەن ڕۆژێك پێش نووسینی ئەم بابەتە ،لە کاتێکدا خەریکی هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی چەند پێگەیەکی سەر تۆڕی ئینتەرنێت بووم کە دەربارەی گەردوون و تازەترین هەواڵ و ڕاستی زانستی جێگیر بوو، ئەوەی کتوپڕ بوو بەلامەوە ئەوە بوو هەواڵێك بوو کە لە پێگەی ڕوانگەی ئەوروپی باشور بلأوکرابوەوە بە ناو و نیشانی " سەربوردێك لە سەر چنراوی گەردوونی زۆر زوو " پاش ئەوەی چەند دێڕێکم لێخوێندەوە بۆم دەرکەوت کە قورئانی پیرۆز پێش ئەوانە کەوتوە بە ١٤ سەدە لەمەوبەر کە باس لە چنراوی گەردوونی دەکات و بە "الحبك" ناوی دەبات بەڵکو خوای گەورە سوێندی پێدەخوات .

## ووشەی "الحبك" لە ڕووی زمانەوانیەوە

لە ڕاستیدا بابەتەکە هەروا سادە و سانا نیە ،ئێمە واین لە خزمەت کتێبی پیرۆزی خـوای گـەورەدا قـسەکردنیش لـەو کتێبـە پـیرۆزە بـە بـێ شـارەزایی و زانیـاری خاوەنەکەی بەرە و مانـدوبوون و تـوڕەیی خـوای مـەزن دەبات ،بۆ مـن نیـە بـە هـیچ جۆرێك کە مانایەك بدەم بە ئایەتێك کە هەڵیناگرێت و لە تواناشمدا نیە کە مانای ئایەتەکە بەرەو ئاقارێکی نوێ ببەم تا بە تەواوی دڵنیا نەبم لەوەی کە ئایەتەکە ئەو مانایـەش هەڵـدەگرێت و ئـەوەش یەکێکـە لـە مەبەسـتەکانی خـوای گـەورە . بـەڵام پەلەکردن لە ڕاڤەی ئایـەتێك لـە ئایەتـەکانی قورئـانی پیرۆز بە پشتبەستن بە تیۆریـە زانـستیەکان لەوانـە کـە لـە دواڕۆژدا ئـەو ڕاڤەکردنـە وا دەرنەچێت و دەرکـەوێت کـە هەڵەیـە ،ئـەوەش بـە باشـی ناگەڕێتـەوە بـۆ قورئـان و دەبێتـە بەڵگەیـەك بـە دەسـت دوژمنانی ئیسلامەوە بۆ ووتن لەو ئاینە پیرۆزە بە مەبەستی گومان دروستکردن لە

سەر ئیعجازی زانستی لە قورئانی پیرۆز ،بۆیە پێویستە پێش هەموو شت بەرەو زمانی عەرەبی بڕۆین کە ئەم قورئانەی پێ دابەزیوە و بگەڕێین بە دوای ماناکانی ئەو ووشەیە کە منیش هەر وام کردوە ،پاش گەشتێکم بە نێو فەرهەنگە زمانەوانیەکاندا بینیم کە ئەو ووشەیە لە کرداری "حبك" ەوە هاتوە کە عەرەب دەڵێن "حبك النساج الثوب " بە مانای جۆلاَکە جلەکەی چنی وە " حبك الحائك الثوب" واتە بە باشی و توند و تۆڵی چنینەکەی ئەنجامداوە ، هەروەها " الحُبُك " کۆی ووشەی " حبيكة " یە کە مانای ڕێگا دێت .

لە میانەی ئەو مانا زمانەوانیانەی ووشەی " الحُبُك " بۆم دەرکەوتوە کە ووشەکە گەلێك مانای بنەڕەتی وەك چنراو و دەزووی ڕستراو بە توند و تۆڵی پێکەوە . بەلاَم ڕاڤەکارانی پێشوو ڕەحمەتی خوایان لێبێت ڕەهەندەکانی ئەو مانایانەیان نەزانیوە چونکە لەو سەردەمەی ئەواندا ئەم گەردوونزانیەی ئێستا نەبوە بەڵکو لەوەش زیاتر تەمەنی ئەو بیرۆکەی " چنینە " لە چەندساڵێك تێپەڕ نابێت .



وێنەی (٧)   وێنەی چتراوی گەردوونیە وەك لە میانەی گەورەترین كرداری كۆمپیوتەریەوە وەدەردەكـەوێت ،ئەوانـەی كـە وەك دەزووی چـنراو دەردەكـەون لـە ڕاسـتیدا بـریتین لـە بلیۆنەها مەجەڕە كە بە شێوەیەكی ڕێكوجوان و پتەو ڕیز بوون كە ئەوەش ئەوەی قورئـان ناوی "الحبك " ی لێناوە و بەڵكو سوێندیشی پێدەخوات !



وێنــەی (٨)  وێنەیــەکی دیکــەی چــنراوی گەردوونیــە کــە خاڵــە ڕووناکــەکانی شــوێنی کۆبونەوەی مەجەڕەکان دەردەخات کە هەروەك ملوانکە دەردەکەوێت و هـەروەك ئەوەیـە کـە ئێمـە لـەردەم دەزووی چـنراو و ڕسـتراوی زۆر ووردا بـین دە خوێنــەری بیر لـە مانـای ئـەم ئایەتـە بکـەرەوە ( والـسماء ذات الحبـك ) ئایـا ئـەو ئایەتـە گـوزارش نیـە لـەو وێنەیـەی کـە ملیۆنەها دۆلاری تێچوە !؟

## کتو پڕیەکی نوێ

لـە میانـەی مانـای زمانـەوانی ووشـەکەوە مـن بـۆم دەرکـەوت کە شێوەی ئـەو چـنراوە گەردوونیـە دەبێـت وەك دەزووی تێهەڵبەسـتراو و بەیەکداچـوو و پێکـەوە بەسـتراو بـن ئـەوە کتوپڕیـەك بـوو و کتـوپڕی دوەمـیش ئـەوە بـوو کـە ببینـیم وێنـەی ئـەو چـنراوە گەردوونیـە نایابـە لـە لایـەن گـەورەترین سـوپەر کۆمپیوتـەرەوە دەکێـشرێت ،کـە بـە تـەواوی بریتــی بـوو لـەو شـێوە دەزووە چـنراوە جـوان و قەشـەنگانەی کـە مـن بـۆی دەچووم کە ئەوەش بەڵگەی گەورەیی و دەسەڵاتی خوای گەورەیە !

لە میانەی وێنە نوێیەکانی چنراوی گەردوونی کە سوپەر کۆمپیوتەرەکان بۆ یەکەم جار لە سەدەی ٢١ هەمدا دروستیان کردوون کە سەدان بلیۆن مەجەڕە دەگرێتەوە و

هەر مەجەڕەیەکیش بە سەدان بلیۆن ئەستێرەی تێدایە و پنتە ڕووناکەکان کۆمەڵگای مەجەڕەکان دەنوێنن کە هەموویان لە لایەن خوای گەورەوە بە جوانترین شێوە ڕستراون و سوێندیشیان پێدەخوات لەبەر گەورەییان (والسَّمَاءِ ذَاتِ الحُبُكِ) ﴿الذاريات: ٧﴾! بەڵام تەنها ئەم بابەتە زانستیە دەربارەی ڕوخسارەکانی ئەو چنراوە گەردوونیە بەس نابێت ،لەوانەیە ئەوە تەنها تیۆری بێت و ڕاستی زانستی نەبێت منیش وەك بڕواداریك پێویستە کە دڵنیابم لە هەر زانیاریەکی نویٚ و بگەڕێم بە دوای سەلماندنی ڕاستیەکەیدا پێش ئەوەی پێی قایل ببم تا بیروباوەڕم لە سەر بنچینەیەکی زانستی دابڕێژم ،بۆیە دەستم دایە خوێندنەوەی سەدان لێکۆڵینەوە دەربارەی چنراو و دەزووی گەردوونی کە هەر هەموویان ماوەی چەند ساڵیکە دەرچوون و بۆم دەرکەوت کە هەموو زاناکان جەخت لە سەر ڕاستی ئەو چنراوە گەردوونیە دەکەنەوە و سورن لە سەر ئەوەی کە ئەوە ڕاستیەکی زانستیە و ڕوونترین و ئاشکراترین ڕاستی زانستی سەدەی ٢١ هەمە !!!

## مانای زیاتر و دەلالاتی زیاتر

پاش ئەوەی کە بە ووردی و بە هاوکێشەی ژمێرەیی و وێنەی کۆمپیوتەریەوە لە چنراوەکە گەیشتم ، بۆم دەرکەوت کە قورئانی پیرۆز زۆر بە ڕاشکاوانە لە چنراوی گەردوونی دەدوێت ئەو چنراوەی کە ئەمڕۆ زاناکانی خۆرئاوا شانازی بە خۆیانەوە دەکەن کە ئەوان یەکەمینن کە ئەوەیان دۆزیبێتەوە !

بەڵام بەڵگە و موعجیزەی زۆری دیکە هەن ،پێش ئەوەی دەستبکەین بە بیرکردنەوە لە مانا زۆرەکانی ئایەتەکە پێویستە یەکەمجار بزانین تۆژینەوە نوێیەکانی سەدەی ٢١ هەم گەیشتونەتە کویٚ لە بواری زانستە گەردوونیەکاندا .لەم چەند ساڵە کەمەی دووایيدا زاناکان بۆیان دەرکەوتووە کە هەموو ئەوەی لە لایەن مرۆڤەوە بینراوە کەمترە لە ٥٪ ی هەموو گەردوون و زیاتر لە ٩٥٪ ی گەردوون نەبینراوە و بریتیە لە ماددەی نەبینراو کە بە ماددەی ڕەش دەناسرێت ! لە میانەی وێنەکانەوە ماددەی ڕەش دەبینرێت کە لەو چنراوە گەردوونیەدا بە ڕەنگی ڕەش دەردەکەوێت ،ئەو ماددەیەی کە نێوانی هەموو مەجەڕەکانی پڕکردۆتەوە و دەست بە سەر دابەشبوونی ماددەی بینراو دەگرێت لە گەردوونی بینراودا ،ئەو وێنە گەردوونیانەش بەهۆی

سۆپەر كۆمپیوتەرەكانەوە دروستكراون ،كە هەر خاڵێك لە خاڵەكانی ئەو وێنانە بریتین لە هەزاران یان ملیۆنەها مەجەڕە ،سەرنج بدە لە گەورەیی گەردوون و بەدیهێنەری گەردوون كە زانایی و توانا و بێ خەوشی هەر بۆ خۆیەتی كە ئەو چنراوە ڕەنگینەی بەدیهێناوە ، با بزانین خوای گەورە چی دەفەرموێت (فلا أُقْسِمُ بما تُبْصِرونَ * وما لا تُبْصِرونَ ) ﴿الحاقة: ٣٨-٣٩﴾. قورئانی پیرۆز ئاگاداری كردووین بەوەی كە زۆر شت هەن كە ئێمە نایانبینین و سویندیان پێدەخوات لەبەر گرنگیان و قورئانیش ڕاستە و ڕاست دەفەرموێت ئاخۆ لەو ئایەتەی پێشوودا ئاماژە نیە بۆ ئەو مادده تاریكە نەبینراوەی گەردوون ؟!

بەڵام پرسیارێك هەیە ئاخۆ چۆن زانا خۆرئاواییەكان توانییان ئەو مادده تاریكە بدۆزنەوە لە كاتێكدا نابینرێت ؟چۆن چنراوی گەردوونیان دۆزیەوە ،یان چۆن ئەو ناوەیان لێنا لە كاتێكدا ئەوان قورئانیان نەدیوە ؟

ئالێرەدا وا پێویست دەكات كە گەشتێكی دیكەی گەڕان و لێكۆڵینەوە بكەین بە نێو تازەترین دەستكەوتی زاناكان لەو بوارەدا ،ئیتر كتوپڕیەكی سەرسوڕهێنەری دیكە كەوتە بەردەمم كاتێك جەختی زاناكانم خوێندەوە كە ئەو چنراوەیان دۆزیەوە و بۆ یەكەم جار بینیان و دەڵێن : ئێمە هیچ گومانمان لەوە نیە كە ئەوە بۆ یەكەم جارە دەزوویەكی گەردوونی زۆر پچووك لە گەردوونی زوودا دەبینین . ئینجا بە تەنها ووشەیەك دەڵێن : ئێمە ئەو دەزووە لە كاتێكدا دەبینین كە تەمەنی گەردوون تەنها ٢ بلیۆن ساڵ بوە ،و گەردوونزانەكانیش دەتوانن دابەشبوونی مادده لە گەردوونی زوودا ببینن .بەڵام ئەوەی سەرنجی ڕاكێشام ئەوەیە كە ئەو زانایانە ووشـــەی وەك ( نری ) واتە دەبینین بەكاردەهێنن و دەیخەنە نێوان دوو كەوانەوە وەك ئەوەی ووشەیەكی نوێ بێت كە ئەوان بەكاری دێنن لە كاتێكدا ئەو وێنانەی ئەوان دەیبینن وێنەی ئەو چنراوانەیە كە لە پێش ١٣ بلیۆن ساڵ لەمەوبەرەوە بەدیهێنراون !

پاش بیركردنەوەیەكی قوڵ هۆی ئەوەم زانی كە بۆچی ئەو زانایانە سورن لەسەر ئەوەی سیما و سیفەتی ئەو چنراوە ببینن و ئەو فەرموودەیەی خوام بیركەوتەوە كە بەرامبەر بە نكوڵكارانی كتێبە پیرۆزەكەی فەرموویەتی ((أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقاً فَفَتَقْنَاهُمَا)؟ ﴿الأنبياء: ٣٠﴾.

گەورەیی بۆ ئەو خوایەی كە دەفەرموێت ( او لم یر ) واتا ئایا نابینن و ئەوانیش دەڵێن ( اننا نری ) وا دەبینین وەك ئەوەی ووشەكانی خوای گەورە دووپات دەكەنەوە

بە بیٚ ئەوەی بە حۆیان بزانن !
و خوا دەفەرموێت ( الذين كفروا ) واتە بێبڕواکان و دان بە بیٚ بڕوایی و نکوڵیەکانی خۆیاندا دەنێن و خوای گەورە کاتەکە بە ( كانتا ) واتە لە ڕابوردوودا دەردەبڕێت ئەوانیش دەڵێن گەردوونی زۆر زوو ، خوا دەفەرموێت ( رتقا ) زاتە ئاسمانەکان و زەوی بارستەیەکی گەورە و توند و تۆڵ بوون ئەوانیش دان بەوە دەنێن کە یەکەم دەزوولەی پچووکی گەردوونیان بینیوە لە شێوەی بارستەیەکی توند وتۆڵدا و ئینجا دەفەرموێت لێکمانکردنەوە واتە تەقینەوە مەزنەکە ( ففتقناهما )،ئایا ئەوە موعجیزەی قورئانی نیە کە پێویستە هەموو موسڵمانێك شانازی بکات بەو کتێبەی کە سەرچاوەی هەموو ڕاستیەکان و سەرسوڕمێنەرەکان !

## ئایـــا بڕواناهێنن ؟

بەرامبەر بەو موعجیزە قورئانیە ،موعجیزەی گوتاری قورئانی پیرۆز بۆ بێبڕواکان بەوەی کە ئەوان ئەو دیاردە گەردوونیەی یەکەم جار دەبینن و ئەوان بە ڕوونی ئەو چنراوە گەردوونیەیان بینی لە میانەی ئامێر و کۆمپیوتەرەکانیانەوە ،ئایا ئیتر کاتی ئەوە نەهاتووە کە ئەوان بزانن ئەو قورئانە لە لایەن ئەو خوایەوەیە کە بەدیهێناون و کاری دۆزینەوەی ئەو نهێنیانەی بۆ ئاسان کردون و ئینجا لە قورئانەکەیدا ناوی ئەوانەی هێناوە پێش ١٤ سەدە لەمەوبەر کە ئەو نهێنیە دەدۆزنەوە پێش ئەوەی بیدۆزنەوە !بەڵێ ئەوان ئەو چنراوەیان دیتەوە و بەردەوامیشن لە لێکۆڵینەوەکانیان بۆیە دەبینین کە ئایەتەکە پرسیار دەکات (أفَلا يؤمنون) ؟؟؟ وەك دەشزانین لە فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبیەوە کە ( الرتق) بە مانای ( السد) ویان چنراوێك لە شێوەی سیٚدێکی زۆر توند و تۆڵ و ( الفتق) کە بە مانای ( کردنەوە یان تەقاندنەوە) دێت و هەردوو ووشەکەش الفتق و الرتق ئاماژەیەکی ڕوون بۆ چنراو دەکات و ئەو پرسیارەش ئەوەیە کە ئاخۆ ئەوانە ئەو ئایەتە دووبارە دەکەنەوە بە بیٚ ئەوەی بینیبێتیان ؟ کاتێك قورئانی پیرۆز بە ڕاشکاوانە ڕادەگەیەنێت کە گەردوون ( رتقا ) بوە واتە چنراوێکی پێکەوە بەستراوی توند بوە هەر وەك بەنداوێکی زۆر بەهێز دەبینین کە زاناکانی سەردەم جەخت لەوە دەکەنەوە کە ئەوان ئەو چنراوەیان بینیوە لە سەرەتا زوەکانی تەمەنی گەردوون !!بەڵکو ئەو زانایانە هەر هیچ گومانێکیان نیە

لە بوونی ئەو چنراوە ،لەوەش زیاتر ئەوان پرسیار دەکەن لە چۆنیەتی ڕستنی ئەو دەزوولە گەردوونیە گەورانە ، تۆش خوێنەری بەڕێز لەگەڵ مندا بیر بکەرەوە لەو چنراوەی کە کۆمپیوتەر لە سەر بۆردێکی سێ دووری بۆ بەشێکی گەورەی گەردوونی بینراو بۆی وێنا کردووین کە لێوەی دەردەکەوێت ئەوەی لەم گەردوونەدا دەیبینین زۆر کەمترە لەوەی نایبینین !! .

## ڕاستیە زانستیەکان

پێویستە ئێستا ئەوە بزانین کە چۆن زاناگەردوونیەکان وا بە ڕاشکاوانە باس لەو چنراوە گەردوونیە دەکەن و بەڵکو هەموویان لەسەری کۆکن ،بابەتەکە لەوەوە دەستپێدەکات کاتێك زاناکان دەستیانکرد بە وێنەکێشانی نەخشەکانی ئەستێرەکان و مەجەڕەکان و تێبینی ئەو شوێنانەیان کرد کە مەجەڕەکانی تێدا کۆدەبێتەوە کە بە ناوی هێشوە مەجەڕەکان دەناسرێن و بۆیان دەرکەوت کە لە گەردووندا زیاد لە (٢٠٠) هەزار ملیۆن مەجەڕە هەیە !!
کاتێك توانایی هەژمارکردنی گەورە پەیدابوو بە بەکارهێنانی سوپەرکۆمپیوتەرەکان زاناکان بیریان لەوە کردەوە کە هەموو زانیاریە پێویستیەکان بخەنە نێو ئەو کۆمپیوتەرە زەبەلاحانەوە ،زانیاریەکانیش بریتین لە ڕوونکردنەوەی ژمارەیی دەربارەی شوێنی مەجەڕەکان و دووریان بە ساڵی ڕووناکی و توندی تیشکدانیان و زانیاری دەربارەی کۆبوونە گەورەکانی ئەو مەجەڕانە و زانیاری دیکە کە زیاد لە یەك ملیۆن مەجەرە دەگرێتەوە ، کاتێك کۆمپیوتەرەکە کردە ژمێرەییەکانی ئەنجامدا وێنەی بەرهەمهاتوو بریتی بوو لە چنراوێك بۆیە یەکسەر زاناکان ناوی چنراوی گەردوونیان لێنا .
ئێستا ئەگەر پرسیارێك ئاراستەی ئەو زانایانە بکەین کە ئەو چنراوە ئاڵۆزەیان دۆزیوەتەوە و بە بلیۆنەها دۆلاریان سەرف کردوە لەو پێناوەدا ،پێیان بڵێین : ڕاتان چییە دەربارەی ئەوەی ئێوە لە سەدەی ٢١ هەمدا دۆزیوتانەتەوە لە کتێبێکدا باسکراوە کە لە سەدەی حەوتەمی زاینەوە ئەو کتێبە هەیە ؟!
ئەوان زۆر بە پەلە وەلأم دەدەنەوە و دەڵێن ئەوە کارێکی ستەمە و شتی وا هەرگیز نابێت ،چونکە باس لە چنراوی گەردوونی و قسەکردن لە رتق و فتق پێویستیان بە

هاوێنە و ڕوانگەی گەورە هەیە کە لە هەموو لاکانی جیهاندا دادەنرێن و پێویستیان بە هەزاران تۆژەرەوە دەبێت بۆ وێنە کێشانی ئەو نەخشانە و دیاریکردنی شوێنی مەجەڕەکان و شیکردنەوەی شەبەنگەکانیان . ئەوانەش هەموو پێویستیان بە ئامێری زەبەلاحی وەك سوپەرکۆمپیوتەر و مەسرەفی زۆر گەورە دەبێت کە ئەوانەش لەم سەردەمەدا نەبێت بە دی نایەن ئیتر چۆن کەسێك لەو سەردەمە زۆر دوورەی پێشوودا باس لە چنراوی گەردوونی دەکات ؟.

پێیان دەڵێین بەڵێ قسەکانتان ڕاستە ئەگەر قورئان قسەی مرۆۋ بوایە ،بەڵام ئەو قورئانە فەرموودەی خوای گەورەیە کە بەدیهێنەری مرۆۋەکانە ،ئایا ئێوە دڵەکانتان مل کەچ دەبن بەرامبەر بەو موهجیزەیە کە بەڵگەیەکی ماددی ڕوونە لەسەر ڕاستی پەرتوکی خوا و ڕاستی پەیامی ئیسلام . بۆیە وا باشە گوێ لەم ئایەتە پیرۆزە بگرن :

(وَمَا كَانَ هَـذَا الْقُرْآنُ أَن يُفْتَرَى مِن دُونِ اللّهِ وَلَـكِن تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ الْكِتَابِ لاَ رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ الْعَالَمِينَ) ﴿يونس: ٣٧﴾.، واتە ئەم قورئانە هەڵبەستراوی کەسێکی دی نیە جگە لە خوای گەورە خۆی بەڵکو بە ڕاستی لە لای خواوە دابەزیوە و هەموو شتەکانی وورد کردۆتەوە و هیچ گومانێکی تێدا نیە و لە لای پەروەردگاری جیهانەکانەوە دابەزیوە .

## * دەنگێك لە ئاسمانەوە

ووتاری نوسەرێکم خوێندەوە کە تێیدا هێرش دەکاتە سەر ئیعجازی زانستی لە قورئانی پیرۆزدا ،ئەو نوسەرە پێی خۆش نیە کە کتێبی خوا موعجیزە بێت لە ڕووی زانستی و گەردوونیەوە ،ئەو بە لایەوە سەیرە کە هەر ڕاستیەکی گەردوونی هەبێت و قورئان ئاماژەی بۆ بکات و دەڵێت کە نوسەرانی ئیعجازی زانستی چۆنیان پێ خۆش بێت ئاوا ڕاڤەی ئایەتەکان دەکەن بە جۆرێك ئایەتەکان ئەو مانا و ڕاڤانە هەڵناگرن ! بێگەردی هەر بۆ خوایە ،کاتێك ئەو ووتارەم خوێندەوە و وەك پیشەی خۆم ڕووم کردە هەندێك لە سایتە زانستیەکان بۆ بەدواداچوونی هەواڵەکانی فەزا و دۆزینەوە نوێیەکان لە کاتێکدا من لاپەڕەی ماڵپەڕەکانم هەڵدەدایەوە چاوم کەوتە سەر ووتارێکی سەیر بە ناوی ( گەردوونی سەرەتا دەدوێت ) !!!

لە سەرەتادا وام زانی کە ئەوە ناونیشانی چیرۆکێکی خەیاڵی زانستیە یان هۆنراوەیە یان کورتیلە چیرۆکە ،بەلأم لە دواتردا بۆم دەرکەوت کە ئەو هەواڵە یەکێك

لە بەناوبانگتریتی سایتە فەزاییەکانی جیهان بە ناوی www.space.com بلاوی دەکاتەوە و خاوەنی ئەو دۆزینەوە نوێیە یەکێکە لە زانا گەردوونیەکان بە ناوی پرۆفیسۆر ( مارك ویتلێ ) لە زانکۆی فیرجینیا .
ئەو زانایە لە تۆژینەوەکەیدا ئەوەی سەلماندوە کە گەردوون لە قۆناغە سەرەتاییەکانیدا کاتێك گاز و گەرد و پلەیگەرمی بەرز بوە، شەپۆلی دەنگی دەرکردوە و بوونی ناوەندێکی ماددی لە گازی چڕی زۆر یارمەتیدەر بوە بۆ بلاوبونەوەی ئەو شەپۆلە دەنگیانە ،لە ڕاستیشدا ئەو دۆزینەوەیە بەرهەمی ئەو لێکۆلێنەوانە بوە کە دەربارەی تیشکدانی مایکرۆیی باکڕاوندی گەردوونی بوە لە قۆناغە سەرەتاییەکانی گەردوون پاش تەقینەوە مەزنەکە . لە بەرخۆمەوە جارێکی دی ووتمەوە بێگەردی بۆ خوا ، باشە بۆچی ئەو برادەرە نوسەرەی هێرش دەکات ئەو هەواڵەی بە لاوە سەیر نیە ؟ئاخۆ گەردوون زمان و قوڕگی هەیە تا قسەی پێبکات؟ خۆزگە ئەو نوسەرە بیزانیایە کە قورئان زۆر بە ڕاشکاوانە باسی لەوە کردوە ،بەڵکو زۆر لەوە سەیرتریش قورئان باسی لە شتی زۆر لەوە وردتریش کردووە و بە گوزارشی ڕاستەوخۆ زۆر ورد و ڕاشکاوانە دەری بڕیوە بە جۆرێك لێکدانەوەی ناوێت ،لەمەودوا ووتەی ئەو زانا ماددیانە بە زمانی خۆیان دەهێنین ئینجا سەیری قورئانی پیرۆز دەکەین تا ئەوە ببێتە ئیعجازێکی گەردوونی سەرسوڕێنەر !

## شەپۆلە دەنگیەکانی سەرەتاکانی گەردوون

بەپێی ئەو هەواڵە زانستیەی کە زۆربەی گۆڤارە زانستیە پسپۆڕیەکان و پێگە ئەلکترۆنیەکان بلاویان کردەوە و لە سەر زمانی نووسەری هەواڵەکە بەم جۆرە هاتوە:
" پاش تەقینەوە مەزنەکە گەردوون زۆر بە خێرایی لە ماوەیەکی دیاریکراودا کە بە ماوەی گەورە بوون دەناسرێت فراوانبوو ، لە دوای ئەوە گەردوون بە هێواشی بەردەوام بوو لەسەر گەورەبوونەکەی کە ئەوە بوە هۆی ساردبوونەوەی گازەکانی و چڕبوونەوەیان و دروستبوونی ئەستێرەکان ،ئەو ماوانە هەموو گۆڕانکاریەکانی چڕی بەشداربوون لە دروستبوونی سیفەتەکانی دەنگ کە لە لایەن تیمی ( ویتلێ ) ەوە

دیاریكرا " *

---

* له وتارێكی دیكەی نوسەردا ئەو دەقانە و سەرچاوەكانیان كە لە بەر پەیوەندی بەتین و ڕاستەوخۆی بە بابەتەكەوە بە پێویستم زانی كە زیادی بكەم ، بەم جۆرەی خوارەوە هاتوون ( وەرگێر ) :

"The universe expanded rapidly after the Big Bang, during a period called inflation. Later, it continued to expand at a slower rate as it cooled enough for gas to condense and form stars. All this time, density variations contributed characteristics to the sound that Whittle's team has determined." )

واته : " پاش تەقینەوە مەزنەكە گەردوون زۆر بە خێراییی لە ماوەیەكی دیاریكراودا كە بە ماوەی گەورە بوون دەناسرێت فراوانبوو ، لە دوای ئەوە گەردوون بە هێواشی بەردەوام بوو لەسەر گەورەبوونەكەی كە ئەوە بوە هۆی ساردبوونەوەی گازەكانی و چڕبوونەوەیان و دروستبوونی ئەستێرەكان ،ئەو ماوانە هەموو گۆڕانكاریەكانی چڕی بەشداربوون لە دروستبوونی سیفەتەكانی دەگ كە لە لایەن تیمی ( ویتڵ ) ەوە دیـــــــــاریكرا . " ........ سەرچـــــــــاوە/

http://www.space.com/scienceastronomy/big_bang_sound_040601.html

یان "the cry from the birth of the cosmos can be heard"

واتە دەتوانرا كە دەنگی گریانی لەدایك بوونی گەردوون ببیسرێت ..... سەرچاوە /

http://news.bbc.co.uk/1/hi/sci/tech/3832711.stm ) زیادكردنەكـــــە تەواو بوو .

---

لــە میانــەی لێدوانــەكانی زاناكــان و دۆزینەوەكانیانــەوە بۆمــان دەردەكــەوێت كــە گەردوون لـە قۆناغـەكانی سـەرەتایدا واتـە لـەو كاتـەوەی كە لـە قۆنـاغی گازیـدا بـوە و كاتێك ئەستێرەكان دەستیان بە دروستبوون كردووە لەو گازە گەردوونیەوە گەردوون دەنگێكی دەركـردوە كـە ئـەو دەنگـە بـەردەوام بـوە تـا نـەمـەنی گـەردوون گـەیوەتـە یـەك ملیـۆن سـاڵ ، ئـەوەش دەركـەوتوە كـە ئـەو دەنگـە لەسـەرخۆ بـوە و پـاش ئـەوەش ئەستێرەكان دەستیان بە دروستبوون كردوە . ئەوەی سـەیرە ئەوەیـە كە لـە قورئـانی پـیرۆزدا بـاس لـەو دۆزینـەوە گرنگـە كـراوە پـێش چـواردە سـەدە لەمەوبـەر وەك دەفەرموێت (قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِالَّذِي خَلَقَ الْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُ أَنْدَادًا ذَلِكَ رَبُّ الْعَالَمِينَ * وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ مِنْ فَوْقِهَا وَبَارَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَا أَقْوَاتَهَا فِي أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَاءً لِلسَّائِلِينَ * ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ائْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ * فَقَضَاهُنَّ سَبْعَ سَمَوَاتٍ فِي يَوْمَيْنِ وَأَوْحَى فِي كُلِّ سَمَاءٍ أَمْرَهَا وَزَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَحِفْظًا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ)( فصلت ٩-١١)

سەرنج لە ووشەی ( قالتا )بدە واتە ووتیان ئایا لە ووتنەوە دەنگ دەرناچێت !؟ .
من لەو دۆزینەوە گەردوونیە نوێیەدا وەڵامی ئەو پرسیارەم دەستکەوت کە ماوەیەکی زۆر بوو سەرقاڵی کردبووم و وێڵ بووم بە دوای تێگەیشتن لە مانای ئەو شایەتانەی باس لە سەرەتاکانی دروستبوونی گەردوون دەکات (ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ائْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ) ﴿فصلت: ١١﴾.
منیش ڕاڤەی قورئانم خوێندەوە بۆم دەرکەوت کە زۆربەیان جەخت لەو دەکەنەوە کە پەیڤینی ئاسمان قسەی ڕاستی بوە ، ئەوەتا ئیمامی قورتوبی ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) لە مانای ( ...ا قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ) دا دەفەرموێت " بەڵکو زۆربەی زانایان دەڵێن : خوای گەورە لە هەردووکیاندا واتە ئاسمان و زەوی قسەکردنی دروستکردوە و وەك ئەوەی خوای گەورە بیەوێت قسەیان کردوە "

## لەرەلەری گەردوونی هێمن

بەلاًم ئاخۆ ئەوە ڕاستیەکی زانستیە یان تیۆرێك و گریمانەیەکە ؟ بەلاًم وەك هەموو دەزانین کە ناکرێت لە خۆمانەوە ڕاڤە بۆ کتێبی خوایی دابنێین بە بێ سەلماندن و بەڵگەی تەواوەتی بۆیە وا پێویست دەکات کە گەشتێکی فراوان بکەم بە نێو دونیای هەواڵە زانستیەکاندا تا بۆم دەرکەوت کە هیچ یەکێك لە هۆکانی ڕاگەیاندنی خۆرئاوا دژایەتی ئەو هەواڵە ناکەن چونکە پشتگیر کراوە بە لۆژیکی زانستی و پراکتیکی .




<u>وێنەی (٩ )</u> وێنەی قۆناغەکانی پەرەسەندنی گەردوون هەر لە تەقینەوە مەزنەکەوە تا ئەمڕۆ ،زاناکان وای بۆ دەچن کە گەردوون لە( ٧ر ١٣ )بلیۆن ساڵ لەمەوبەرەوە بە تەقینەوە مەزنەکە دەستیپێکردوە و بەردەوامە لە فراوانبوون، قورئانیش پێش زاناکان کەوتووە بە ١٤ سەدە لەمەوبەر و ئاماژەی بەو ڕاستیە زانستیە داوە (والسماء بنیناها بأید وإنا لموسعون) ﴿الذاريات: ٤٧﴾.



<u>وێنەی (١٠)</u> گەردوون بە تەفینەوە مەزنەکە دەستیپێکرد ئینجا پێکنەرەکانی لێك دوورکەوتنەوە و بەوەش مەجەڕەکان و ئەستێرەکان دروستبوون ،قورئانی پیرۆزیش باس لەو قۆناغانە هەموو دەکات بەو پەڕی ووردیەوە وەك دەفەرموێت : (أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَي أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ) ﴿الأنبياء: ٣٠﴾.

ئەو کەسەی بیر لەو یاسا بیرکاریانە دەکاتەوە کە خوای گەورە لە گاز و دوکەڵدا داینـاون و لـە میانـەی ئـەوەی پـێ ی دەوترێـت ئەنـدازەی میکـانیکی شـلەکان ،هـەر گازێك کاتێك دەکشێت و قەوارەکەی زیاد دەکات لەو کشانەوە شەپۆلی وا دەردەچێت کە لەوانەیە بیستراو بێت ئەوەش لە ئەنجامی گۆڕان لە چڕی گازەکە و جوڵەی گەردەکانی و بەریەککەوتنیان ، ئەوەش ئەوەیە کە لە سەرەتای دروستبوونی گەردووندا ڕوویدا کاتێك گەردوون دوکەڵ بوە ، فراوانبوون و کشانی گەردوونی بوە هۆی ئەو لێکخشاندن و بەریەککەوتنەی پێکنەرەکانی ئەو شۆربا گەردوونیە گەرمە و شوونی ئەو دەنگانەی کە وەك دەنگی ورشەی درەخت بوون ،هەتا هەندێك لە زانایان توانیویانە وێنەی هێڵی بەیانی ئەو لەرەلەرە گەردوونیانە بکێشن .

ئەو ئایەتە زۆر بە ڕوونی باس لە دەنگی گەردوون دەکات کاتێك لە قۆناغی دوکەڵیدا

بـوه ،بـەڵام بۆچـی خـوای گـەوره ئـەو قۆناغـە زووەی تەمـەنی گـەردوونی بـە دوکـەڵ نـاوبردووه ؟ ئـەو ووشـەیە ڕاسـتترینە بـۆ گـوزارش لـە ڕاسـتی گـەردوون لـەو کاتـەدا چونکە لەو کاتەدا گەردوون پڕبوو بە گازی گەرم و تۆزی گەردوونی و ئەو گازەش وەك هەور وابوو . بە ڕاستیش زاناکان توانیویانە ئەو هەورە ببینن لـە دەوری یـەکێك لە ئەستێرە زۆر دوورەکانی لێواری گەردوونی بینـراو و لـەوە جـەخت دەکەنـەوە کـە ئەسـتێرەکان ئـا لـەو ئەسـتێرانە دروسـتبوون .وێنـە گێراوەکـانی دەوری یـەکێك لـە ئەستێرەکانیش دەریخستوە کە ئەو ئەستێرەیە بە پەڵەیـەك لـە دوکـەڵ دەورە دراوە و وەك گلۆپی داگیرساو دەردەکەوێت و ئەگەر ئەو گلۆپە گەردوونیە داگیرساوە نەبوایـە ئەو گاز و تـۆوە گەردوونیـەی نـەدەبینرا خـوای گـەورەش زۆر بـە جـوانی وەسـفی ئـەو تەنـە پرشـنگدارانەی کـردووە وەك گلـۆپ وەك دەفـەرموێت : ( وَزَيَّنَّـا الـسَّمَاءَ الـدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ) ﴿فصلت: ١٢﴾، سەرنجی ئایەتەکە بدە بە ووردی !

## گریانی ئاسمان

بەڵام ئەوەی کە زۆر سەیر و سەرنج ڕاکێشە ئەوەیـە کـە زاناکـانی ئـەمڕۆ ڕایدەگەیـەنن ،ئەوەی پرۆفیسۆر ( ویتڵ ) لە هەواڵێکی زانستیدا ڕایدەگەیەنێت ئەمەیە [(١)] :

( دەتوانین دەنگی گریانی لە دایك بوونی گەردوون ببیستین ! ) . منیش ئـەو ئایەتـەم بە بیردا دێت کـە دەفـەرموێت (فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ السَّمَاءُ وَالْأَرْضُ وَمَا كَانُوا مُنْظَرِينَ) ﴿الدخان: ٢٩﴾.و ئەوەی زۆر سەیرە ئەوەیە کە ئەو ئایەتەی باس لە گریانی ئاسمان دەکات لە سورەی( الدخان ) دایە !( ئەوە ڕای نوسەرە و مەرجیش نیە مەبەست ئەوە بێت ..وەرگێڕ)

ئەو هەواڵە زانستیەی پێشوو ئەوە دەردەخات کە دەشێت دەنگ و گریـان و شـتی وا ڕوویـدابێت لـە گەردوونـدا کـە پێـشتر لـەوە نەگەیـشتبوون ئەمـە ئـەوە دەردەخـات کـە هەموو ووشەیەکی قورئانی پیرۆز ڕاست و دروسـتە ،بـەڵام بۆچـی دەبێـت ئـەو دەنگـە گەردوونیە بەجێهێنانێکی فەرمانی خوایی بێت ؟

هـەموو زاناکـانی ئـەمڕۆ جـەخت لـەوە دەکەنـەوە کە فراوانبـوونی گـەردوون و کـشانی گازەکـەی ئـەو دەنگانـەی دروسـتکردووە و لـەو کشانانەش ئەسـتێرەکان دروسـتبووە واتە فۆناغی دوای گاز و دوکەڵەکان قۆناغی دروستبوونی ئەستێرەکان بوە .

(١) "the cry from the birth of the cosmos can be heard" .

واتە دەتوانرا کە دەنگی گریانی لەدایك بوونی گەردوون ببیسرێت ..... سەرچاوە /
http://news.bbc.co.uk/1/hi/sci/tech/3832711.stm

---




**<u>وێنەی ١١</u> وێنەیەکی بەیانی بۆ ئەو لەرەلەرە دەنگیانەی کە لە گەردوونەوە دەرچوون لە قۆناغە سەرەتاییەکانی پەیدابوونی ،لە میانەی شیکردنەوەی زاناکان بۆ ئەو لەرەلەرانە دەردەکەوێت کە گەردوون هێمن و لەسەرخۆ بوە(چەماوەکان نووکی تیژیان تێدانیە) ئەوەش لەگەڵ فەرموودەی خوای گەورەدا بە تەواوی گونجاوە دەربارەی سەرەتاکانی گەردوون کە دەفەرموێت (ثم استوى إلى السماء وهي دخان فقال لها وللأرض إتيا طوعاً أو كرهاً قالتا أتينا طائعين) ﴿فصلت: ١١﴾.**

## لە دوکەڵەوە بۆ گڵۆپەکان

بەڵام دەربارەی قۆناغی دوای دوکەڵ لە قورئاندا کامەیە ؟ قورئانی پیرۆز لەو بارەوە چیمان پێدەفەموێت ؟ ئەگەر بە ووردی سەرنجی ئەو ئایەتە بدەین کە ڕاستەوخۆ دوای ئایەتی دوکەڵ دێت و دەفەرموێت (فَقَضَاهُنَّ سَبْعَ سَمَوَاتٍ فِي يَوْمَيْنِ وَأَوْحَى فِي كُلِّ سَمَاءٍ أَمْرَهَا وَزَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَحِفْظًا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ) ﴿فصلت: ١٢﴾، هەروەها دەبینین کە ئایەتەکە باس لە ڕازاندنەوەی ئاسمان دەکات بە ئەستێرەکان ئەوەش ئەوەیە کە زاناکان دەقاودەق باسی دەکەن وەك بینیمان ! هەموو زاناکانیش جەخت لەوە دەکەنەوە کە قۆناغی دوای دوکەڵ لە بەدیهاتنی



وێنـەی ١٢ ئەسـتێرەی دوور کـە وەك گڵـۆپی داگیرسـاوی پرشـنـدار دەردەکـەون و دەورو پشتی خۆیان ڕووناك دەکەنەوە هەتا ئێمە بەهۆیانەوە دەتوانین دوکەڵی گـەردوونی ببـینین زاناکـان دەربـارەی ئـەو ئەسـتێرانە دەڵـێن کـە ئەگـەر ئـەوان نەبوونایـە ئێمـە نەمانـدەتوانی دەوروپشتەکانیان لە گەردوون ببینین ،واتـە ئەوانـە ئاسمان ڕووناك دەکەنـەوە دەی ئەوانـە دەبنە گڵۆپی داگیرساوی بە شەوق و ئەو وەسفە جوانەش پێشتر لە قورئاندا ناوزەد کراوە ( وزينَّا السَّماء الدنيا بمصابيح ) ﴿فصلت: ١٢﴾.

گەردووندا بريتی بوە لە قۆناغی دروستبوونی گلۆپەکان واتە ئەستێرە پرشنگدارەکان ، ئایەتەکەش یەك لە دوای یەك باس لەو دوو قۆناغە دەکات لە پێشدا دوکەڵ و ئینجا گلۆپەکان واتە ئەستێرەکان ! ئایا ئەو بەدوایەکداهاتنە هەروا بە ڕێکەوتە یان بە ویستی خوای گەورە خۆیەتی کە دەفەرموێت (ذلك تقدير العزيز العليم)؟؟

## گلۆپە گەردوونیەکان *

هەموو زاناکان لە سەر ئەوە کۆکن کە گەردوون پڕبوە لە گازێکی گەرم و ئینجا ساردبۆتەوە و یەکەم جار ئەستێرەکان دروستبوون ،قورئانیش وا باس لە ئسمان و گەردوون دەکات کە دوکەڵ بوون و ئینجا ئاسمانی ڕازاندۆتەوە بە ئەستێرەکان کە بە گلۆپیان ناو دەبات ،باشە بۆچی خوای گەورە بە تایبەتی لەو ئایەتەدا نەیفەرموە (وزينا السماء الدنيا بنجوم، أو كواكب، أو مجرَّات...)؟ بۆچی لەو قۆناغەی تەمەنی گەردووندا کە دوکەڵ بوە ناوی گلۆپی هێناوە ؟ لە فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبیەوە ئەوە فێردەبین کە گلۆپ ( المصباح ) بەکاردێت بۆ ڕووناککردنەوەی ڕێگاکان ،بەلاّم ئەو ئەستێرانە ڕووناکیان زۆر کزە و بە حاڵ دەبینرێن ئیتر کویّ ڕووناك دەکەنەوە ؟
ئـەو پرسـیارە پاڵنـەرم بـوو بـۆ گەشـتێکی چـڕ و پـڕ بـۆ نێـو دونیـای دۆزینـەوە گەردوونیـەکان دەربـارەی سـەرەتاکانی گـەردوون و دروسـتبوونی ئەسـتێرەکان و دوکـەڵی گـەردوونی ،بـەلاّم ئـەوەی زۆر سـەیر بـوو بەلامـەوە منـی خسـتە نێـو دەریـای سەرسـوڕماوی و حەپەسـاویەوە ئـەو وێنـە زۆر جوانانـەی ئـەو ئەسـتێرە و نیمـچە ئەستێرانە بو کە زۆر پرشنگدار و بە شەوق بوون ،و ئەوان گەیشتنە ئەوەی کـە ئـەو ئەستێرانە کۆنترینن لە گەردووندا و ڕێگای نێوان خۆیان و ئێمەیان ڕووناککردۆتەوە زاناکـان سـوودیان لـەو ڕووناکیـە بـەهێزەی وەرگرتـوە کـە دەگاتـە ڕوونـاکی هـەزاران خۆری وەك خۆرەکەی خۆمان !!!! ... بۆیە ناوێکی نامۆی نوێیان لێناوە کە بریتیە لە گلۆپە دۆزەرەوەکان یان ( flashlights ) ،گەورەیی و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە دەفـەرموێت (وَزَيَّنَّـا الـسَّمَاءَ الـدُّنْيَا بِمَـصَابِيحَ وَحِفْظًـا ذَلِـكَ تَقْـدِيرُ الْعَزِيـزِ الْعَلِـيمِ) ﴿فصلت: ١٢﴾.واتـە ئاسمانمـان ڕازاندۆتـەوە بـە گلۆپـەکان و وە وەك پـارێزەرێکیش ئـەوەش کـاری وورد و ئەنـدازەگیری خـوای بەدەسـەلاّتە زاناکـانی ئـەمڕۆش بـەو ئەسـتێرانە دەڵـێن کـە پـێش ١٤ سـەدە لەمـەوبر قورئـانیش بـە هـەمان سیفەت نـاوی

هێناون ،ئایا ئەوە گونجان و هاوئاهەنگی تەواو نیە لە نێوان قورئان و دۆزینەوە گەردوونی و زانستیەکان و ڕاستیەزانستیەکان و لە هەمان کاتیشدا وەڵامێکی دابڕە بۆ ئەوانەی کە گومانیان لە ئیعجازی زانستی و گەردوونی قورئان هەیە ، هەوڵیش دەدەین کە دەقاودەق ووتەی زاناکان بێنین لە دەمی خۆیانەوە و لە سەرچاوەکانیانەوە .

## دۆزینەوەکان جەخت لە ڕاستێتی قورئان دەکەنەوە

لە یەکێك لە ووتارە زانستیەکاندا هاتوە بە ناونیشانی " کەی بینای گەردوونی یەکەمجار دروست بووە ؟ " لە وەڵامدا دەڵێن :" لە بەر ئەوەی ئەستێرە پرشنگدارەکان ماوەی نێوان ئێمە و خۆیان ڕووناك دەکەنەوە ،بۆیە ئەو ئەستێرانە وەك گڵۆپی دۆزەرەوە کار دەکەن وسیفەتەکانی گەردوونی سەرەتامان بۆ دەردەخەن" من تێبینی ئەوەم کردوە کە هەموو ئەو زانایانە کاتێك دەدوێن و باس لەو ئەستێرە پرشنگدارانەی سەرەتای گەردوون دەکەن بە گڵۆپی دەچوێنن هەتا یەکێك لەوانە دەڵێت " ئەو ئەستێرانە وەك گڵۆپی زۆر شەوقدار کاردەکەن ."
کاتێك ئەو زانایانە ئەو ئەستێرە دوورانەیان دی هاوگونجاویەکی تەواویان بینی لە نێوان ئەوانە و ئەو گڵۆپە شەوقدارانەی کە ڕێگا ڕووناك دەکەنەوە ،بۆیە ئەوانیش ئەو ناوی گڵۆپانەیان بەکارهێنا ،گەورەیی و بێگەردی بۆ ئەوەی پێش ئەوانە کەوت لەو ناو لێنانەدا ،چۆن پێشیان ناکەوێت کە هەر خۆی بەدیهێنەری ئەو گڵۆپانە و گەردوونیشە !ئەمڕۆ زانا گەردوونیەکان ئەو ئەستێرە و نیمچە ئەستێرە پرشنگدارانە دەبینن کە دەکەونە لێوارەکانی گەردوونی بینراوە و بە هەزارانساڵی ڕووناکی لێمانەوە دوورن ،وەك گڵۆپی تەواو لە نێو تاریکی دەیجوردا دەردەکەون ، ڕووناکی ئەو ئەستێرانە زۆر لە ڕووناکی مەجەڕەکانی دەوروپشتیان زیاترە ،لێرەدا شوێنی خۆیەتی کە ئەو پرسیارە بکەین : ئاخۆ مانای ئەو هەموو هاوئاهەنگی و گونجاویە چییە لە نێوان ئەوەی زاناکانی سەدەی بیست و یەك دەیدۆزنەوە و ئەوەی کە پێش ١٤ سەدە لەمەوبەر لە قورئاندا باسکراوە ؟و مانای ئەوە چییە کە ئەوەی زاناکان دەیدۆزنەوە هەمان ئەو ناوانەی لێدەنێن کە قورئانی پیرۆز بەکاری هێناون بە بێ ئەوەی ئەوان قورئانیان خوێندبێتەوە !!؟
ئەوانە تەنها مانای ئەوەیە کە ئێوەی بێبڕوا و نکوڵیکار لە کتێبی خوا ،هەرچەندە

لێکۆڵینەو و تۆژینەوە بکەن و هەرچەندە شتی نوێ بدۆزنەوە ئەوا لە کۆتایی ڕێگادا هەر دەبێت بگەڕێنەوە بۆ ئەو قورئانە گەورەیە و هەر دەگەڕێنەوە بۆ لای ئەو خوا گەورەیەی کە ڕۆزی داون و ئەو هەموو ئامێر و کەلوپەلەی لە بەردەم داناون تا ئەو نهێنیانە بدۆزنەوە و بە نیشانە و موعجیزەکانی خوای گەورە ئاشنا بن ،ئەو خوایەی کە خۆی پەیمانی داوە کە نیشانە و بەڵگەکانی گەورەیی خۆتان نیشان بدات لە نێو جەستە و دەروونی خۆتانەوە تا هەموو گەردوون و بە هەموو ئاراستە و ئاسۆکان تا بۆتان دەردەکەوێت کە ئەو قورئانە هەمووی فەرموودەی خوایە وەك خوا دەفەرموێت (سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ * أَلَا إِنَّهُمْ فِي مِرْيَةٍ مِنْ لِقَاءِ رَبِّهِمْ أَلَا إِنَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ مُحِيطٌ) ﴿فصلت: ٥٣-٥٤﴾.

## قورئان و دوکەڵی گەردوونی

هەندێك لە ڕۆژهەلأتناسەکان پرۆپاگەندەی ئەوە دەکەن کە ئەو قورئانە پڕە لە هەڵەی زانستی وەك ئەوەی کە ووشەی ( دخان ) ی بەکارهێناوە ! بە بەڵگەی ئەوەی کە گوایە پێناسەی زانستی بۆ دوکەڵ ناگونجێت لەگەڵ بارەکانی سەرەتایی گەردوون ،کە لەو کاتانەدا گەردوون لە هەردوو توخمی گازی هایدرۆجین و هیلیۆم پێکهاتبوون و ووشەی ( دخان ) کە لە قورئاندا هاتوە بۆ وەسفکردنی ئەو بارە گەردوونیە (ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ائْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ) ﴿فصلت: ١١﴾ زۆر وورد نیە لە ڕووی زانستیەوە ،بۆیە قورئان لە لایەن خوای گەورەوە دانەبەزیوە چونکە خوا هەڵە ناکات !!

هەروەها ئەوان دەڵێن کە بەکارهێنانی ووشەی ( گاز ) باشترە بەکاربهێنرێت لە ڕووی زانستیەوە نەك (دخان )، لەوانەوە ئەو ڕەخنانەم بیرکەوتەوە کە ناحەزانی ئیعجازی زانستی لە قورئان دەربارەی ئەو ئایەتە دەیڵێن و گومان لە ڕاستێتی دەکەن و دەڵێن گوایە موحەمەد خۆی ئەو ئایەتەی داناوە و هەڵەی لە بەکارهێنانی ووشەی دخان دا کردووە کە بۆ سەرەتاکانی گەردوون بەکاریهێناوە .

پەروەردگارا من داوای لێبووردن دەکەم لە ووتەی ئەوانە و من هیچ گومانم نیە لە تاکە ووشەیەك لە ووشەکانی کتێبە پیرۆزەکەت ،بڕوام بە قورئان زۆر لەوە زیاترە کە

بە چاو دەیبینم یان بە دەست دەیگرم چونکە لەوانەیە هەستەکانمان هەڵە بکەن بەڵام هەرگیز خوای گەورە هەڵە ناکات ،و لە سەرەتادا من وتوومە لەبەر ئەوەی قورئان لە ژینگەیەکی بیاباناویدا دابەزیوە بۆیە بە زمانی خەڵکی ئەو کاتە گوتاری داوە و ووشەی ( غاز ) یان گاز لەو کاتانەدا لە زمانی عەرەبیدا نەبوە چونکە ئەوە ووشەیەکی بیانیە بۆیە ووشەی دخان ی بەکارهێناوە و ئەوە زۆر ڕوونە .

بەڵام بە خێرایی ئەوە هاتەوە بیرم کە قورئان تەنها بۆ عەرەب نەنێرراوە بەڵکو بۆ هەموو مرۆڤایەتی دابەزیوە و تەنها بۆ ژینگەیەکی دیاریکراو و سەردەمێك لە سەردەمەکان نەنێردراوە بەڵکو بۆ هەموو کات و شوێن و سەردەمێك دابەزیوە ، ئەی دەبێت چارە چی بێت ؟ دەستم کردەوە بە گەڕان بە نێو هەموو دۆزینەوە زانستیە نوێیەکان ،بەڵام بۆ قایلکردنی ئەو دوودڵانە زۆر پێویست دەکات کە جەختکردنەکە لە لایەن زانایانی خۆرئاوا خۆیانەوە بێت کە ووشەی دخان ڕاستە نەك غاز ،ئەوەش کارێکی زۆر گران دەبێت وەك قورئان دەفەرموێت (وَلَنْ يَجْعَلَ اللَّهُ لِلْكَافِرِينَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ سَبِيلًا)﴿النساء: ١٤١﴾. بۆیە خوای گەورە کارەکەی ئاسان کردو هەر لە زمانی ئەو زانا خۆرئاواییانەوە کە ووشەی ( دخان ) ڕاستە و ئەوەیان دۆزیەوە کە بە ( الدخان الكونى ) دەناسرێت و شانازیش بەو دۆزینەوەیان دەکەن ،دەبا بزانین ئەوە چۆن بوو ؟

## گاز یان تۆز یان دوکەڵ ؟

زاناکان ئەوەیان دۆزیەوە کە گەردوون لە سەرەتاکانی دروستبوونیدا پڕبوە لە گاز بە تایبەتی دوو گازی هیلیۆم و هایدرۆجین ،بەڵام لە دواتردا ئەوەیان دۆزیەوە کە گەردوون پڕبوە لە تۆزی گەردوونی cosmic dust کە بە نێو ئەستێرەکاندا بڵاو بوونەتەوە و دەڵێن کە ئەو تۆزە گەردوونیە بریتیە لە پاشماوەی تەقینەوەی ئەستێرەکان ،بەڵام ئاشکرایە کە گاز جیاوازە لە تۆز و ئەویش جیاوازە لە دوکەڵ ئەی دەبێت چۆن گونجاندن هەبێت لە نێوان زانست و قورئاندا ؟ خۆ ئێمە ئەوە ڕەت دەکەینەوە کە دەقی ئایەتێك بە مانایەك ڕاڤە بکەین کە هەڵیناگرێت تا نەبێتە هۆکارێك بۆ تانە دان لەم ئاینە مەزنە .

دەستم کرد بە گەڕان بە دوای دۆزینەوە گەردوونیەکاندا بەڵام کتوپڕیەکی سەیر بوو

کاتێك کە لێدوانی یەکێك لە زانا گەردوونیەکانی خۆرئاوام بەرچاو کەوت کە دەڵێت ئەوەی دۆزیومانەتەوە لە تۆزی گەردوونی هیچ پەیوەندیەکی بە تۆزەوە نیە ئەو تۆزەی لای ئێمە ناسراوە و هەر لەویش ناچێت بەڵکو ئەوەی ناو نراوە تۆز لە دوکەڵی جگەرە دەچێت !!! .

ئەو زانایەش ( دکتۆر دۆگلاس بیرس ) کە بە یەك ووشە دەڵێت " تۆزی گەردوونی کە لە ڕاستیدا بە هیچ جۆرێك لە تۆزی ناوماڵ ناچێت ،بریتیە لە دەنکۆڵەی ڕەقی وورد کە بە زۆری لە کاربۆن و سلیکۆن پێکهاتوە و لە نێو ئەستێرەکاندا مەلە دەکەن و قەبارەیان وەك قەبارەی دوکەڵی جگەرە وایە " .بۆیە ئێستا ئەو زانایانە بەو تۆزە گەردوونیە دەڵێن دوکەڵی گەردوونی چونکە ئەوە بە هیچ جۆرێك لە تۆز ناچێت و ئەو ناو لێنانەی پێشوو هەڵە بوە ،ئێستا لێکۆڵینەوە نوێیەکان هەر بە دوکەڵی گەردوونی ناوی دەبەن و بگرە لە نێو زانایانیشدا هەیە کە دەڵێت باشترین وەسفی گەردوون لە قۆناغەکانی سەرەتاییدا ئەوەیە کە بە دوکەڵی گەردوونی ناوزەدی بکەن !!

## باشترین ووشە بۆ وەسفی گەردوونی سەرەتا دوکەڵە

ئەمەی خوارەوە یەکێکە لەو ووتارە زانستیانە نوێیانەی کە نووسەرەکەی بە ڕاشکاوانە دەڵێت : " گەردە ووردەکانی تۆز تێکەڵ بە گەردەکانی گاز کە تیرەیان بە ئەندازەی بەشێك لە یەك مایکرۆن دەبێت ( مایکرۆن بەشێکە لە هەزار بەشی ملم ) بۆیە باشترین وەسف بۆ ئەو بارە ( دوکەڵ ) دەبێت . " پاك و بێگەردی بۆ خوا کە چۆن ئەو ئایەتانەی دابەزاندوە ! زانایان واق وڕماون لە زاراوەکانیاندا ،لە سەرەتادا ووشەی گازیان بەکارهێنا و ئینجا کردیان بە تۆز و وا ئێستاش باشترین ووشە بە لایانەوە ( دخان ) واتە دوکەڵ یان smoke دەبێت چونکە وەك خۆیان دەڵێن ئەو تۆزە زۆر جیاوازە لە تۆزی ئاسایی لای خۆمان ،لە کاتێکدا قورئان ئەو ووشەیەی لە پێش زیاد لە ١٤٠٠ ساڵ لەمەوبەرەوە بەکارهێناوە !!

زاناکان زۆر بە ڕاشکاوانە ئەو ناوەی دووایيان بەکارهێنا پاش ئەوەی ئەوان توانییان نمونەیەکی وا وەرگرن و شیبکەنەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ بلیۆنەها ساڵ لەمەوبەر واتە بۆ ئەو کاتانەی کە گەردوون لە سەرەتاکانیدا بوە کە ئەوەش بە تەواوی گونجاوە لەگەڵ دەقی ئایەتەکانی وەك (ثم استوى إلى السماء وهي دخان )،ئایا ئەوە ڕێکەوتە

یان موعجیزەیە ؟!



<u>وێنەی ( ١٣ )</u> وێنەی دوکەڵی گەردوونی وەك زاناکان لە چاوی ئامێرە نوێیەکانیانەوە بینویانە کە ئەو دوکەڵەش هەر لە دوکەڵی جگەرە دەچێت وەك ئەو زانایانە جەختیان لێکردۆتەوە ،١٤٠ سەدە لەمەوبەریش قورئان باسی ئەو ڕاستیەی کردووە !



وێنەی ( ١٤ ) گەردەکانی دوکەڵی گەردوونی وەك ئەوەی کە زاناکان نمونەیان لێدەستکەوتوە و شیانکردۆتەوە و دەرکەوتوە کە وەسفی دوکەڵ باشترین وەسفە بۆ ئەو گەردانە کە ئەوەش سەد لە سەدا گونجاوە لەگەڵ ئایەتە قورئانیەکاندا !

## ساتی گفتوگۆ

دەمانەوێت پرسیار لەوانە بکەین کە وا گومان دەبەن گوایە ئیعجازی زانستی بۆ ئایەتێك ڕاڤەکردنێتی بەوەی کە هەڵیناگرێت و دارشتنی چەمکی دروستکراوی وا کە نەگونجاوە لەگەڵ ووشەکانی قورئاندا ،و نووسەرانی ئیعجازی زانستی دەقی ئایەتەکان وا لێدەکەن کە لەگەڵ دۆزینەوە زانستیەکاندا بگونجێت ،بەوانە دەڵێین کە ئایا ووشەی smoke بە تەواوی بە مانای (دخان ) نایەت ؟کە ئەوەش ووشەیەکی زۆر وورده بۆ وەسفی باری گەردوونی سەرەتایی پێش بلیۆنەها ساڵ لەمەوبەر و ئەو

ووشەیەش دەقاو دەق لە قورئانی پیرۆزدا هاتوە ئایا ئەوە موعجیزەی سەرسوڕێنەر نیە ؟ ئاخۆ ئێمە ڕاڤەی ووشەیەك دەکەین بە مانایەك کە هەڵیناگرێت ؟یان خۆی مانای ووشەکە لە بنەڕەتدا ئەوەیە ؟! هەتا زانا فەزاییەکان و لە سەر گەورەترین پێگەی فەزایی لێکۆڵینەوە لەو تۆزە گەردوونیە دەکەن و بە یەك ووشە دەڵێن :

" گەردەکانی تۆزی گەردوونی زۆر زۆر پچووکن و بۆ ئەوەی لە ماوە و قەوارەیان تێبگەین باشترین ڕێگا بەراوورد کردنیەتی بە دوکەڵی جگەرە . " واتە هەموو زاناکان دەڵێن کە ووشەی (دخان ) باشترین وەسفە بۆ تێگەیشتن لەو تۆزە گەردوونیەی کە هەموو گەردوونی داگرتبوو پێش ١٠ بلیۆن ساڵ لەمەوبەر ،ئەو دوکەڵەش بەهێزترین بەڵگەیە لەسەر ڕاستی فەرموودەی خوای گەورە (أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ) ﴿الأنبياء: ٣٠﴾ ، بە پێی ئەو ئایەتە گەردوون هەمووی ڕستێکی چنراوی توند و تۆڵ بوە پاشان خوای گەورە لێکیان دەکاتەوە بە تەقینەوەیەك و ئەو دوکەڵەش پاشماوەی ئەو تەقینەوە گەردوونیە مەزنە بوە کە خوای گەورە لە کتێبەکەیدا ئاماژەی پێداوە پێش ١٤ سەدە لەمەوبەر و پێش ئەوەی زاناکان پەی بەو نهێنیە بەرن .

## بەڵام ئەوانە ڕاستین یان تیۆرین ؟

پێویستە لە سەرمان کە دوای هەموو دۆزینەوەیەکی زانستی یان گەردوونی نەکەوین تا دڵنیا نەبین لە ڕاستێتی و دروستی ،و هیچ لەوانە بەسەر قورئان نەسەپێنین تا بە تەواوی دڵنیا نەبین لە ڕاستێتی ،بۆیە هەقی خۆیەتی کە یەکێك پرسیار بکات :چۆن زاناکان دڵنیا دەبن لە زانیاریەکان و چۆن زانییان کە ئەو تۆزە گەردوونیە لە ڕاستیدا دوکەڵە ! ئەوە دەمانبات بەرە و ئەوەی کە ئاماژە بەو دۆزینەوەیە بکەین کە لەم دووایانەدا خرایە ڕوو ،زاناکان توانییان چەند گەردێکی دوکەڵی گەردوونی لە سەر سنورەکانی هەسارەی موشتەریەوە بە دەستبێنن ،ئەو نمونانەیان شیکردەوە و وێنەیان گرت و هەموو وورد و درشتێکیان لە بارەیەوە خستەڕوو کە کەس ناتوانێت نکوڵی لەو تاقیکردنەوانە بکات ،لە ئەنجامی شیکردنەوەی تاقیگایی دەرکەوت :

" تیرەی دەنکۆڵەکانی ئەو تۆزە گەردوونیەی لە نێو ئەستێرە و هەسارەکاندایە لە نێوان ( ٦ر. تا ٤ر١ ) مایکرۆنە و ئەو دەنکۆلأنەش لە بەرگە زەوی هەسارەی موشتەریەوە یان لە ناوچەی کاریگەری موگناتیسییەوەی وەرگیرابێت بە پێی

لێکۆڵینەوەکانیش دەنکۆڵەیەك بەو ماوانە کە لە سنوری مویەکی سەردایە بریتی دەبێت لە گەردەکانی دوکەڵ . "



وێنەی ( ١٥ ) دیوارێك لە ئەستێرە و دوکەڵی گەردوونی کە درێژیەکەی دەگاتە ١٥٠٠ ساڵی ڕووناکی و لە گەردووندا بە ملیۆنەها لەو دیوارانە هەن کە هەر هەموویان بە بێ هیچ ستوونێك بەو ئاسمانەوە ڕاگیراون کە ئەوانیش یەکێکن لەو بینا گەردوونیانەی کە خوای گەورە باسی کردوون وەك دەفەرموێت (اللَّهُ الَّذِي رَفَعَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُسَمًّى يُدَبِّرُ الْأَمْرَ يُفَصِّلُ الْآيَاتِ لَعَلَّكُمْ بِلِقَاءِ رَبِّكُمْ تُوقِنُونَ) ﴿الرعد: ٢﴾.



وێنەی ( ١٦ ) ئەمڕۆ زاناکان دەڵێن کە ئەستێرە پرشنگدارەکان یەکەمین بوون لە دروستبووندا دوای قۆناغی دوکەڵی گەردوونی ،ئەم وێنەیەش لە دایك بوونی ئەو ئەستێرە سەرەتاییانەیە لەو دوکەڵە ، سەیر لەوەدایە کە قورئانی پیرۆز یەکەمینە کە باس لەو بەدویەکداهاتنەی ئەستێرە و دوکەڵانە دەکات وەك دەفەرموێت (ثم استوى إلى السماء وهي دخان) و یەکسەر بە دوایدا دێت و دەفەرموێت ( وزينا السماء الدنيا بمصابيح ).

ئایەتەکە باس لە قۆناغێکی زووی تەمەنی گەردوون دەکات لە سەرەتای بەدیهاتنندا ، کاتێك دوکەڵێکی گەرم هەموو گەردوونی پڕ کردبوو ،ئەوەش لەم ئایەتەدا دەبینین (ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ).ئایەتەکە گوزارشت لە چۆنیەتی ڕاستی گەردوون دەکات لەو کاتەدا بە تەنها ووشەیەك کە ( دخان )ە کە ئەو ووشەیە کورتکراوەی زۆر لەو ڕستە و دەستەواژە دوور و درێژانەیە کە زاناکانی ئەمڕۆ بەکاریان هێناوە بۆ وەسفکردنی ئەو بارەی سەرەتای گەردوون کە ئەوەش بۆ خۆی موعجیزەیەکی گەورەی قورئانە !.

ئەمەش ئەوە دەردەخات کە قورئان لە ڕووی زانستیەوە زۆر ڕاستە و باس لە باری گەردوون دەکات (ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ) ﴿فصلت: ١١﴾ ،خۆزگە ئەو زانایانە قورئانیان دەخوێندەوە و ئەوەندە خۆیان هیلاك نەدەکرد بە گەڕان بە دوای زاراوە و ووشە و ناودا ،چونکە وادەبینین کە زانایانی سەدەی بیست و یەك بە دوای هەمان ووشە قورئانیەکاندا دەگەڕێن وەك ووشەی ( فضاء ) کە لەم دواییانەدا دەرکەوت کە هیچ ناگەیەنێت چونکە بۆشایی لە گەردووندا نیە و هەمووی بینای توند و تۆڵ و پتەوە بۆیە ئێستا ووشەی ( بناء ) واتە building بەکار دێنن .

پرسیاریش ئەوەیە کە ئاخۆ ئەو دیمەنە ئیعجازیانەی قورئان خاوەن ویژدان و ژیری بیریان لێدەکاتەوە ؟لێرەدا ئەوانە ڕادەچڵەکێنین کە دڵیان بەرامبەر گەورەیی ئەم قورئانە و ئەوەی خوا ناردویەتی داناچڵەکێت و ئەو بانگە خوداییەیان بیردەخەینەوە کە دەفەرموێت ( أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَنْ تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ الْحَقِّ وَلَا يَكُونُوا كَالَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ الْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَكَثِيرٌ مِنْهُمْ فَاسِقُونَ ) ﴿الحديد: ١٦﴾. خوای گەورە زۆر ڕاستی فەرموە کە ئاماژە بەو بەد گومان و دوو دڵانە دەکات سەبارەت بەو قورئانە گەورەیە و دەفەرموێت (سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ أَلَا إِنَّهُمْ فِي مِرْيَةٍ مِنْ لِقَاءِ رَبِّهِمْ أَلَا إِنَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ مُحِيطٌ) ﴿فصلت: ٥٣﴾.

## ئاکامەکانی لێکۆڵینەوەکە و ڕووی ئیعجاز

١ ) لەبەر ئەوەی هەموو ڕاڤەکارانی قورئان و زانایانی زمان کۆکن لە سەر ئەوەی کە بنەڕەتی ووشەی ( الحبك ) لە چنراوێکی توند و تۆڵ و بەهێزەوە هاتوە ،بۆیە قورئان یەکەم کتێبە کە باس لەو چنراوە گەردوونیە دەکات و و دەیبەستێتەوە بە ئاسمانەوە وەك دەفەرموێت ( وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْحُبُكِ) ﴿الذاريات: ٧﴾.و بە ووردی باسی لەو میکانیزمە ئەندازەییە کردوە کە چۆن تەقینەوە مەزنەکەی پێ ئەنجامداوە :( أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقاً فَفَتَقْنَاهُمَا)؟ ﴿الأنبياء: ٣٠﴾.

٢ ) لە ئەنجامە گرنگەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە ئەوەیە کە ئاماژەیەکی ڕوون هەیە لە قورئاندا بۆ ئەوەی کە ئێستا لە گەردوون دەبینرێن لە مەجەڕەکان پێشتر وانەبوون

چونکه له ئایەتەکەدا ووشەی ( کانتا ) ی بەکارهێناوه که به مانای پێشتر وابوه ئەوەش دەست پێشخەریەکی زانستیه له قورئاندا بۆ ئەوەی ئێستا زاناکان پێی دەڵێن ( گەردوون له قۆناغه سەرەتاییەکانیدا یان زوەکانیدا ) .
٣ ) ئەو ووشانەی قورئانی پیرۆز بەکاری هێناون له ڕووی زانستیەوه زۆر ووردن ،بەڵگەش بۆ ئەوه زاناکان له سەدەی ٢١ هەمدا هەمان ووشه قورئانیەکان بەکاردێنن له توێژینەوەکانیاندا ، زاناکان هەمان ووشەکانی قورئان وەك ( الحبك ، رتقا ، ففتقناهما... و زۆری دیکه ) له لێکۆڵینەوەکانیاندا بەکاردێنن !.
٤ ) ئایەتەکه جەخت لەوه دەکاتەوه که ئەوانەی ئەو بەنده گەردوونیه دەبینن بێبڕواکانن که بڕوایان بەو قورئانه نیه بۆیه قورئان باسیان دەکات و دەفەرموێت (أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا)، بۆیه ئەو پرسیاره دووباره دەکەینەوه بۆ ئەوانەی که دەڵێن ئەو قورئانه دانراوی موحەمەد خۆیەتی !! ئاخر ئەو موحەمەده نەخوێندەواره ئەو هەموو زانیاریه ووردانەی له کوێوه هێناوه لەو سەردەمەی خۆیدا ، ئینجا ئەگەر وابوایه بۆچی ئەو دۆزینەوه گەورانه ناداته پاڵ خۆی یان نەتەوەکەی و دەیداته پاڵ بێبڕوایان و ناخەزانی ئیسلام ؟!!! .

## ڕووه جیا جیاکانی ئیعجازی زانستی

له ئایەتەکانی پێشودا چەندین ئیعجاز هەن که نکوڵیان لێناکرێت ، گفتوگۆ له سەر ئەو موعجیزانه دەکەن بێ هیچ لێکدانەوەیەك بەڵکو تەنها له چوارچێوەی مانای ڕاستەوخۆ و ڕوونی ئایەتەکاندا دەمێنینەوه ، له دواییدا دەبینین که چەند ئەو مانایانه ڕوون و ئاشکران و لەگەڵ دۆزینەوه زانستیەکاندا دەگونجێن !
قورئان باس لەپەیڤینی ئاسمان دەکات لەو سەرەتایانەی بەدیهاتنی گەردوون لەوانەیه کەسانێك سەیر بێت لایان چۆن ئاسمان قسه دەکات !بەڵام توێژینەوه و دۆزینەوه زانستیەکان ئەوەیان سەلماندوه که دەکرێت شەپۆلی دەنگی له گەردوونەوه دەرچێت لەو کاتانەی که هێشتا گەردوون له قۆناغی دوکەڵیدا بوه .
قورئان ئەو قۆناغەی دیاریکردوه که ئاسمان تیایدا دەنگی ناردوه که ئەویش قۆناغی دوکەڵی بوه ،زاناکانی ئەمڕۆش ئەوەیان دۆزیوەتەوه که گەردوون لەو قۆناغەی که گاز و دوکەڵی گەرم بوه شەپۆلی دەنگیان ناردوه له ئەنجامی کشانی ئەو

گاز و دوکەڵانە ، چەماوەکانی کە ئامێرەکانی کۆمپیوتەر وێنەیان کردوە و پێشتر ئاماژەیان پێکرا گونجاون لەگەڵ ئەو ئایەتانەی کە باس لەو دەنگانە دەکەن و چواندویانە بە دەنگی منداڵی شیرەخۆرە ! زاناکان دەڵێن دوای قۆناغی دوکەڵی قۆناغی دروستبوونی ئەستێرە پرشنگدارەکان یان کوازارەکانە ،پاش لێکۆڵینەوەیان لەو ئەستێرانە بۆیان دەرکەوت کە ئەوانە وەك گڵۆپن و ڕێگای نێوانمان ڕووناك دەکەنەوە و دەکرێت تەنەکانی دەوروپشتیشیان ببینین .

لێرەدا ئیعجازی یەکەم ئەو دەستپێشخەریە زانستیەیە کە قورئان کردوویەتی بەوەی ئەو ئەستێرانەی ناوناوە ( المصابیح ) واتە گڵۆپەکان کە ئەوە ١٠٠٪ گونجاوە لەگەڵ ئەوەی ئەمڕۆ زاناکان دایانناوە ،ئیعجازی دوەمیش کە قورئان ئەو قۆناغەی دیاریکردوە کە ئەو ئەستێرانەی تێدا دروستبوە کە ئەویش دوای قۆناغی دوکەڵیە ئێمە لە ئایەتی ( وَزَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ) دا دەبینین باس لە ڕازاندنەوەی ئاسمان دەکات بە ئەستێرەی پڕشنگدار ،زاناکان باس لەوەش دەکەن ئەوان ئەو ئەستێرە و مەجەڕانە کە چنراوی گەردوونی پێکدێنن دەچوێنن بە چراخانێك کە ئاسمانیان ڕازاندۆتەوە !!. دیسان ئەوەش دەستپێشخەرێکی زانستی دیکەی قورئانە لە بەکارهێنانی دەستەواژە و گوزارشی وورد و زانستی کە لەگەڵ ڕاستیدا دەگونجێن .ئەگەر سەرنج بدەینە ئەم دەقە قورئانیە دەبینین کە ئاراسنەی ئەوانە کراوە کە بێبڕوان و بڕوایان بە خوای بەدیهێنەر نیە : (قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِالَّذِي خَلَقَ الْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُ أَنْدَادًا ذَلِكَ رَبُّ الْعَالَمِينَ * وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ مِنْ فَوْقِهَا وَبَارَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَا أَقْوَاتَهَا فِي أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَاءً لِلسَّائِلِينَ * ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ائْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ * فَقَضَاهُنَّ سَبْعَ سَمَوَاتٍ فِي يَوْمَيْنِ وَأَوْحَى فِي كُلِّ سَمَاءٍ أَمْرَهَا وَزَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَحِفْظًا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ) ﴿فصلت: ٩-١٢﴾ ، لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کە ئەوانەی ئەو ڕاستیە زانستیانە دەدۆزنەوە بێبڕواکان خۆیانن و ئەوانن کە ئەو ڕاستیانە دەبینن ، کە ئەوەش دەستپێشخەریەکی زانستی دیکەی قورئانە کە ئەوانەی ئەو ڕاستیانە دەدۆزنەوە بێبڕواکان خۆیانن بۆیە گوتارە قورئانیەکە بۆ ئەوانە و بەرەو ڕووی ئەوان دەکرێتەوە !! .

## وەڵام بۆ ڕەخنەگرانی ئیعجازی زانستی

ئاخۆ ئەو ڕووە جیاجیایانەی ئیعجازی زانستی لە قورئاندا بۆ خۆی وەڵام نیە بۆ ئەوانەی کە وای بۆ دەچن مادەم موسڵمانەکان لە ڕووی زانستیەوە دواکەوتوون ئیتر بۆیان نیە باس لە ئیعجازی زانستی قورئان بکەن ! هەروەها وەڵامدانەوەشە بۆ ئەوانەی کە هەردەم دەڵێن موسڵمانەکان چاویان لە خۆرئاوای بێبڕوایە کە ڕاستیە زانستیەکان و دۆزینەوەکانیان پێشکەش بکەن ،ئینجا ئەو ڕاستی و دۆزینەوانە دەگێڕنەوە بۆ قورئان .

بەڵکو بە پێچەوانەوە ، لە دۆزینەوەکانی خۆرئاوا بۆ ئەو ڕاستیە زانستیانە و باسکردنی قورئان بۆ ئەو ڕاسنیانە زۆر بە ووردی و بە دیقەت و گوتاری قورئان بۆ ئەو بێبڕوایانە ،ئەوانە هەموو باشترین بەڵگەن لە سەر ڕاستێتی کتێبی خوا و ئەو قورئانە دانراوی خوای بەدیهێنەرە چونکە ئەگەر دانراوی خوای گەورە نەبوایە و دانراوی موحەمەد بوایە چ پێویستی دەکرد موحەمەد ئەودۆزینەوانە بداتە پاڵ ئەو بێبڕوایانە و نەیدەکردنە موڵکی خۆی !!؟

لە کۆتایی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا هەر ئەوەندەم لە دەستدێت کە سوژدەی بەندایەتی و خۆشەویستی بەرین بۆ خوای گەورە و قورئانەکەی و لەبەر خۆمان ئەم ئایەت بڵێینەوە (وَقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ فَتَعْرِفُونَهَا وَمَا رَبُّكَ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ) ﴿النمل: ٩٣﴾.

**سەرچاوە عەرەبیەکان**

**١- القرآن الكريم.**

**٢- التفاسير المعروفة: تفسير الإمام ابن كثير، تفسير الإمام الطبري، تفسير الإمام القرطبي رحمهم الله تعالى.**

**٣- معاجم اللغة العربية: لسان العرب، الصحاح، القاموس المحيط.**

**٤- أبحاث الدكتور زغلول راغب النجار.**

**٥- أبحاث الشيخ عبد المجيد الزنداني.**

**٦- أبحاث موقع موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة، وعنوانه على شبكة الإنترنت:** 55a.netwww.

**٧- أبحاث الهيئة العالمية للإعجاز العلمي في القرآن والسنّة، وعنوانها على شبكة الإنترنت:** www.nooran.org

**٨- أبحاث علمية على موقع المؤلف "أسرار إعجاز القرآن"** www.kaheel7.com

**سەرچاوە بیانیەکان**

**ئەمانەی خوارەوە گرنگترین سەرچاوەی بیانین کە نووسەری ئەم دانراوە سوودی لێوەرگرتوون :**

**١ ) ووتارێك بە ناو ونیشانی ( سەربوردێك دەربارەی چنراوی گەردوونی )کە سێ زانای خۆرئاوایی زۆر بەناوبانگ نووسیویان کە ئەوانیش زانای گەردوونی (پۆڵ میلەر ) لە پەیمانگای فیزیای گەردوونی لە ئەڵمانیا،( جۆن فینبۆ ) لە هەمان پەیمانگا و ( بارن تۆمسۆن ) لە پەیمانگای فیزیا و گەردوون لە دانیمارك لە سەر پێگەی ڕوانگەی ئەوروپی باشور لە ئەڵمانیا**
http://www.eso.org/outreach/press-rel/pr-2001/pr-11-01.html

٢ ) هەواڵێکی زانستی بە ناوی ( چۆن بینای گەردوونی دروست بوو ؟ ) کە خەڵاتی کارفۆردی ٢٠٠٥ ی ئەکادیمیەی زانستی شاهانەی سویدی وەرگرت ،ووتارەکەش لە لایەن سێ زاناوە نووسرابوو کە ئەمانەن ( جیمس کان ) و ( جیمس بیبلس ) لە زانکۆی برینستۆنی ئەمەریکی و ( مارتین ڕیز ) لە پەیمانگای گەردوونی زانکۆی کامبێردجی بەریتانی ،ووتارەکەش لە سەر ئەم لینکەیە :
http://www.kva.se/KVA_Root/files/newspics/DOC_2005217592_1296017045_popcrafoord05eng.asp

٣ ) ووتارێك بە نا و نیشانی ( کەی بیناگەردوونیەکانی یەکەم جار دروستبوون ) لە سەر پێگەی http://map.gsfc.nasa.gov/m_uni/uni_101firstobj.html

٤ ) ووتارێك بە ناو ونیشانی ( تەقینەوە مەزنەکە لە بەر خۆوە دوا بە قوڵی ) لە سەر لینکی http://www.newscientist.com/article.ns?id=dn4320

٥ ) ووتارێك بە ناو و نیشانی ( گەردوون بە فیشکە دەستیپێکرد نەك تەقینەوە ) لە سەر لینکی http://www.newscientist.com/article.ns?id=dn5092

٦ ) ووتارێك بە ناو ونیشانی ( بیستنی گریانی لەدایك بوونی گەردوون ) کە لە هەواڵەکانی BBC بوو لە ڕۆژی ٢٣ / ٦ / ٢٠٠٤ و لە سەر لینکی
http://news.bbc.co.uk/1/hi/sci/tech/3832711.stm

٧ ) سەیری ووتارێك بکە بە ناو ونیشانی ( ماددەی تاریك لە ناوجەرگەی مەجەڕەکان ) لە سەر سایتی الكون اليوم
http://www.universetoday.com/am/publish/dark_matter_concentrated.html

٨ ) ووتارێك بە ناو ونیشانی (چۆن دەزوەکانی چنراوە بەربەستی گەردوون ڕستران ) واتە How Filaments are Woven into the Cosmic Web کە لە سەر لینکی http://arxiv.org/abs/astro-ph/9512141 .

٩ ) ووتارێك بە ناو نیشانی ( تەقینەوە ئەستێرەییە دوکەڵیەکان نهێنیەك دەکەنەوە کە تەمەنی ١٠ بلیۆن ساڵە) لە سەر لینکی
http://outreach.jach.hawaii.edu/pressroom/2003_casa/

١٠ ) ووتارێك بە ناو نیشانی The Explosive Origin of Dust!

واتە ( بنەڕەتی تەقینەوەی تۆز ) کە لە سەر لینکی
http://www.astro.cf.ac.uk/groups/cosmo/SNe/sne.html